# یەکەمین سەرچاوەکانی هونەری مۆدێرن

**کۆکردنەوە و ڕێکخستنی دەقەکان:**

**هـ . و . جەنسن**

**وەرگێڕ: دکتۆر سەید ئەبولقاسم جەزایەری**

**وەرگێڕ بۆ کوردی**

**سەیوان سەعیدیان**

کوردستان — هەولێر
٢٠٠٦



**ناوی کتێب: یەکەمین سەرچاوەکانی هونەری مۆدێرن**

**کۆکردنەوە و ڕێکخستنی دەقەکان: هـ . و . جەنسن**

**– وەرگێڕ: دکتۆر سەید ئەبوالقاسم جەزایەری**

**– وەرگێڕ بۆ کوردی: سەیوان سەعیدیان**

**– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال ڕواندزی**

**– بەرگ: سەیوان**

**– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات**

**– تیراژ:٧٥٠ دانە**

**– ژمارەی سپاردن: ٥٠**

**– چاپی یەکەم ٢٠٠٦**

**– نرخ: ١٠٠٠ دینار**

**– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە**

**زنجیرەی کتێب – ٥٠– (١٥٣)**

**ناونیشان**

**دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی موکریانی**

**پۆستی ئەلکترۆنی: asokareem@ maktoob.com**

**ژمارەی تەلەفۆن : 2260311**

**www.mukiryani.com**

# ناوەڕۆک

# یوهال یواخیم وینکێلمەن[1]

## ١٧١٧ — ١٧٦٧

## Johann Joachim winckelman

لە کتێبی: هێندێك بیرورِا سەبارەت بە لاساکردنەوەی بەرهەمەکانی یۆنانی لە وێنەگەری و پەیکەرتاشیدا.

بلاوکەرەوەی بە نفوزی وینکێلمەن لە بوارەکانی کەونینەی کلاسیك وەکو((ئەندێشەکان ....)) (١٧٥٥) و ((مێژووی هونەری کەونینە، (١٧٦٤) بناغەکانی کەونینەناسی زانستیی نوێی دامەزراند.

وەکو مۆدێل روانین بۆ کەونینەکان، تەنیا رێگەیە بۆ بە ناوبانگ بوون ... شاکارەکانیان نە تەنیا سروشت بە جوانترین شێوە دەنوێنن، بەڵکو هێندێك لە جوانییە نموونەییەکانی سروشتیش، کە تەنیا لە زەین دا بوونیان هەیە، نیشانمان دەدەن.

لە یەکچوونی ئەو جەستانەی کە ئەمرۆ لەناو خۆماندا دەیانبینین، لەگەڵ جەستەکانی یۆنانی لەوانەیە زیاتر وەك لە یەکچوونی ئیفکێل[2] بە هێرکۆلی برای

[1] نووسەر و ئەندێشمەندی ئوروپی سەدەی ١٨.

[2] Iphicles



نەبێ .... ئیسپارتییەکی[3] لاو بێننە بەرچاوتان: کورێك لە دایك و باوکێکی قارەمان، کە گرفتاری جلە تەنگ و تەسکەکانی ئەورۆیی نییە، لە حەوت ساڵییەوە بەرووتی لەسەر زەوی خەوتوە و هەر لە مناڵییەوە فێری مەلە و زۆرانبازی بووە. ئەم ئیسپارتییە لە تەنیشت سیبارییەکی[4] لاوی ئەورۆیی دابنێن و دوایی بزانین نیگارکێشێك کام لەو دووانە بۆ مۆدێلی ئیسئونی لاو هەڵدەبژێرێ... بەو وەرزشانە لەش لە هەر چەشنە چەوری زیادی پاك دەبێتەوە و حاڵەتێکی شیاو، نەجیبانە و پیاوانە، کە مامۆستایانی یۆنانی بەپەیکەرەکانیان دەبەخشی، پەیدادەکا. لەو کاتدا لە هەرشتێك کە لەشی(جەستە) دزێوکردبایە بەوردبینی دوور دەکەوتنەوە. ئالیبیاد[5] لە لاویدا لە لێدانی فلووت خۆی دەپاراست. چونکە ئەگەری ئەوە هەبوو روخساری ناشیرین بکات. جگە لەوەش، یۆنانییەکان گەلاڵەی جلەکانیان بە جۆرێك دادەرشت کە رێگری گەورەبوونی سروشتی جەستە نەبێ.

لەکاتێکدا جلە تەنگ و تەسکەکانی ئێستامان زیان دەگەیەنێتە جوانی سروشتی لەشمان. بەتایبەت لە هەندێك شوێنی وەکو، گەردەن، ناوقەد و رانەکان. تەنانەت ژنانی یۆنانیش لەو چەشنە مۆدیلە تەسکانە خۆیان دەپاراست.

قوتابخانەی هونەرمەند، وەرزشگابوو. لەوێ، ئەو لاوانەی بەهۆی شەرم و حەیا و سادەیی جلی ئاسایان دەپۆشی، تەواو بەرووتی وەرزیشیان دەکرد. وەرزشگا شوێنی کۆ بوونەوەی هونەرمەندان و فەیلەسووفەکانیش بوو: سوقرات بۆ وانە وتن

[3] Sparton : خەڵکی ئیسپارتا، لێرە لە مانایەکی مەجازی دا بە مانای خۆراگر، دلێر و سادەیە.

[4] Sybarite خەڵکی سیبارِیی ئیتالیا بەمانایەکی مەجازی مرۆڤێکی خۆش گوزەران.

[5] Alcibiades

بەکارمیداست ئار تۆلیکۆس، لیسیز دەچوو بۆ وەرزشگا. فیدیاس بەمەبەستی دەوڵەمەندکردنی هونەرەکەی بەو ئەندامە جوانانەوە، دەچوو بۆ ئەوێ.

لەوەرزیشگا شەخسی فێری جووڵەی ماسولەکان دەبوو و حاڵەت و هێڵەکانی لەشی. جوانترین لایەنەکانی لەشی رووت، لەگەڵ حاڵەتی جۆراوجۆر، شایستە و نەجیبانە کە بەهیچ جۆر لەگەڵ مۆدێلەکانی ئەورۆ بەراورد نەدەکرا، دەخرانەڕوو.

ئەو دەرفەتە زۆرانە بۆ دیتنی سروشت، بوو بە هۆی ئەوەی کە هونەرمەندانی یۆنانی زیاتر بەرەوپێش برۆن و دەستیان بە خولقاندنی چەمکە گشتییەکانی جوانی بۆ بەشە جۆراوجۆری جەستە و هەروەها رێکوپێکی ئەندامەکان کرد. ئەو چەمکانەی کە لە پێشەوەی سروشت وسەرچاوەکەشی هەرێمی مەعنەوەی ئەندێشە بوو. هەر بەوشێوەیەی کە رافائێل، گالاتئای خودی خۆی بەدی هێنا، هەر ئەو جۆرەی کە لە نامەی خۆی بۆ کونت بالتاسار کاستیلۆنە دەڵێ:(( چونکە جوانی لە نێوان ژناندا زۆرکەمە، من وە شوێن ئەو بیرۆکەیە دەکەوم کە لە خەیاڵی خۆمدا دروستم کردوون.

لاساکردنەوەی جوانی سروشت لە سەر بنەمای یەك مۆدێل و یان تێکەڵاوێك لە چەند مۆدێلە. یەکەمیان نوسخەیەکی ورد، واتە پەیکەرێك بەدی دێنێ و بەوبیچم و ئەندامانەی کە لە هونەری ئەڵمانیدا دەیانبینین ، لە دووهەمیاندا بەجوانییەکی تەواو و وێنە ئامانجییەکان دەگات و ئەوە هەمان رێگەیە کە یۆنانییەکان گرتیانەبەر.



## ئێتیی – لویس بولە[1]

## ١٧٩٩ – ١٧٢٨

## Etienne – Louis – BoulLee

**لە: مێعماری، نامیلکەیەك سەبارەت بە هونەر**

جێگەی فەلسەفەی" بولە" لە داوێنی نەریتی رۆمانتیکی ژان ژاك رۆسۆدا[2] بوو "بولە" لەو پێشەکیەدا کە نووسراویەکی بێ بەروارە، بیر، خەیاڵی خۆی لە بواری تەلارسازی دا دێنێتەسەرزمان.

**بۆ ئەو پیاوانەی کە هونەران دەخولقێنن** ئەوینێکی زۆر بەکارەکەی خۆم، بۆتە هۆی ئەوە کەبە تەواوی خۆی بۆ تەرخان بکەم. گەرچی من تەسلیمی ئەو هەستە قوڵە بووم، بەلاَم بەڵێنم بەخۆم داوە کە تەنیا لە پێناو بەرژەوەندییەکانی کۆمەڵگادا کاربکەم تا لەو رێگەوە شیاوی ستایشی خەڵك بم.

هەرلێرەدا دەبێ دان بەوە دابنێم کە خوێندنەوەکانم تەنیا بەمامۆستایانی کەونینە سنووردار نەکردووە، بەڵکو هەوڵم داوە لە رێگای توێژینەوەی سروشت، ئەندێشە پیشەیەکانی خۆم — پیشەیەك کە دوای بیرکرنەوەیەکی زۆر، بەو ئاکامە گەیشتووم کە هێشتا ساوایە- بەربلاَوتر بکەم.

[1] نووسەر و بیرمەندی فەرەنسی

[2] Jean Jacques Rousseau

ئەگەرچی لە رابردوودا سەرنجێکی ئەوتۆی نەدراوەتێ لایەنی شاعیرانەی بیناسازی — کە رێگەیەکی متمانە بەخشە بۆ زێدەکردنی شادی مرۆڤ و رێزلێنان لە هونەرمەندانی شایستە — دراوە! کە ئەوە بڕوای منە، بیناکانی ئێمە و بەتایبەتیش بیناگشتییەکان، دەبێ تا ئاستێك شیعر ئاسا و لەگەڵ ئەو کارە گونجاوبن. بەجۆرێك بێ کە هەستێك لە ناو ئێمەدا بەدی بێنی. بە بڕوای من ئەگەر بڕیار بوایە شیعر تا ئەو رادەیەی کرابا، ئاوێتەی مێعماری خۆم کردبا، ئیئۆری بارستایەکانم خوێندباوە و توێژینەوە و لێکۆلینم لەسەر کردبان، لەگەڵ ئەوەش هەوڵمدابا تا تایبەتمەندی و زاڵ بونیان بەسەر هەستەکانیان وێکچوونیان  لەگەڵ جەستەی مرۆڤ تێگەیشتبام، لەو حاڵەدا پیرۆزبایم بەخۆم ئەوت. ئەگەر بۆ سەرچاوەی یەکەمینی هەموو هونەرەجوانەکان گەڕابامەوە و بیرورای تازەم دەدۆزیەوە، ئەو بنەمایانەم دادەمەزراند کە نیشان دەدا سەرچاوەی یەکەمینیان لە سروشت دا بووە.

ئێوە کە شەیدای هونەرەجوانەکانن، خۆتان بەتەواوی بەو شادی و چێژە بسپێرن کە ئەو هەستە بەرزەتان پێ دەبەخشێ. هیچ شادی و چێژێکی تر وەها بێگەرد نییە. هەر ئەو هەستەیە کە خۆشەویستی بۆ خوێندنەوە لە ئێمەدا بەدی دێنێ. دەردەکانمان دەکا بەشادی، بە بلێسەی جاویدانی خۆی، دەبێتە هۆی ئەوەی چێژ و زەوق هەست، ئیلهامەکانی خۆی بنوێنێ. بەکورتی، هەر ئەو هەستەیە ئێمە بەرەو نەمری بانگەشە دەکا.

من بەرهەمی شەونخونییەکانی خۆم بەئێوە کە هونەرەکان دەخولقێن پێشکەش دەکەم. بە ئێوەی کە بە هەموو زانایتیانەوە گەیشتوونە ئەو بڕوایە — وە ئەوەش تەواو راستە — کە ئێمە نابێ تەنیا کارێك بکەین لاساکەرەوەی رابردووبین.



# ژان ئۆگست دۆمینیك ئەنگر[1]

## Jean - Auguste – Dominque Ingres

## ١٨٦٧ -١٧٨٠

**لە: ((بنەما باوەڕییەکانی ئەنگر))**

موریس دەنیس، ئەندامی گروپی نابییەکان[2] ئەو وتە نەستەقانەی لە نامیلکەکانی ئەنگر و لە بیرەوەری شاگردەکانی کۆکردۆتەوە. هۆنەر دەبێ تەنیا جوانی نیشان بدا...

ئایا ئێوە پێتان وایە کە من ئێوە بۆ ((لوور))  بەرێ بکەم هەتا لەوێ جوانیی ئەو ئامانجە بدۆزنەوە کە لەگەڵ جوانی سروشت جیاوازە؟ ئەم چەشنە گەمژەییانە لە چاخەکانی نەهامەتیدا ، بوون بەهۆی نزم بوونی هونەر. نا، من ئێوە بۆ ئەوێ دەنێرم تا لە کەونینەکانەوە فێربن چۆن لە سروشت بڕوانن. چونکە ئەوان بۆ خۆیان سروشتن" کە دەبێ دەرخواردەی هەر کەسێك بێ.

گرینگ نییە خاوەنی چ جۆرە لێهاتوییەکن. ئەگەر بەتەواوی، نە لە رووی سروشت، بەڵکو بەپێ مۆدیل نیگارکێش بکەن، بۆ هەمیشە کۆیلەی ئەودەبن و شێوەی نیگارکێشی ئێوە بۆنی کۆیلەیەتی لێدێت. پێچەوانەی ئەمەش لە کاری رافائێل دا دەبینرێ. رافائێل بەچەشنێك مۆدێلی دەستەمۆ دەکرد و لە زەینیدا

١- شێوەکاری لە رێبەرانی گرینگی کلاسیزم لە سەدەی نۆزدەدا.

گروپێك کە هاوڕیی و هاو هەنگاوی ئەوان، هەڵوێستێك بوو لە بەرامبەر ئەمیرە سیونستەکان.
(2) Nabis

وەها بەسەریدا زاڵ دەبوو کە مۆدێلە کە بەجێکەی ئەوەی فەرمان بدا، دەستووری بەجێ دێنا...

بۆ ئەوەی لە ناو جوانیدا بیچم بە خۆتان بدەن، لە کاتی رۆیشتن بەرێدا سەرتان بەرەو ئاسمان بەرزکەنەوە، نەك وەکو بەرازێك کە لەناو قوڕوچڵپاو دا خۆی دەگەوزێنێ سەری دانەواندووە.

بیچمە کەونینەکان تەنیا بەو هۆیە جوانن کە لە جوانی دەچن... و ئەگەر سروشت لە جوانییەکانی کەونینە بچێت، هەمیشە جوان دەبێت...

لەسەر گوڵدانەکان لێکۆڵینەوە بکەن.... تێگەیشتن و ناسینی من لە یۆنانییەکان بە گوڵدانەکان دەستپێکرد... من لەسەر دەرگای ژووری کارەکەم دەنووسم: زانکۆی نیگارکێشی، و نیگارکێش پەروەدە دەکەم. نیگارکێشی ئەو پەڕی هونەرە. وێنەگەری هەموو شتێکە، تەواوی هونەرە. پرۆسە ماددییەکانی وێنەگەری زۆر سادەن و دەتوانین لە ماوەی ٨ رۆژدا فێری ببین.

وێنەگەری دروست و نادروستمان نییە، تەنیا و وێنەگەری جوان و ناشیرین مان هەیە. رەنگ یەکێ لە رازینەرەوەکانی وێنەگەریە.

چونکە رەنگ سەرنجی ستایەشکەرانی هونەر بۆ کەماڵی هونەر رادەکێشیێ.

وێنەی لاپەرە ١٤



## ئۆژین دێلاکراوا[1]

## ١٧٩٨ — ١٨٦٣

## Eugene Delacroix

**لە: دەفتەری بیرەوەری رۆژانە**

((دێلاکراوا)) دەفتەری بیرەوەری خۆی لە ساڵی ١٨٢٢ دەسپێکرد و بە شێوەیەکی نارێك هەتا کاتی مەرگی لە ساڵی ١٨٦٣ درێژەی پێدا. ئەو بەو جۆرە دەنووسێ: (( من ئەو شتانە تەنیا بۆ خۆم دەنووسم)) بەو ئاواتەی کە شادییەکی زۆرم پێ ببەخشن.،، دێلاکراوا ئەوەی لە رێکەوتی ٢٠ ی ئۆکتۆبەری ١٨٥٣ لە شامپروسی لە دەفتەری بیرەوەرییەکانیدا نووسی.

چەندە نیگارکێشی ستایش دەکەم! تەنیا بیرەوەری هێندێك لە وێنەکان، کە ناشیان بینم، هەستێکی هەژێنە، لە هەموو لەشمدا دەوروژێنین.

کاریگەرییەك کە هونەر لە بوونەوەرە هەستیارەکاندا بەدی دێنێ زۆر رەمزاویە: کاریگەرییەکی نادیار. ئەگەر کەسێك هەوڵ بدا کاریگەری وەسف بکا، ئەومەبەستە روون و بەهێزدێنێتە سەرزمان، ومن بەتوندی لەسەر ئەو بڕوایەم کە ئێمەش هەمیشە شتێك لەو هەستە زیاد دەکەین کە شتەکان لە ئێمە دا بەدی دێنین. لەوانەیە تەنیا هۆیەك کە بە دیتنی ئەو بەرهەمانە تا ئەو رادەیە هەست بەکەیف خۆشی بکەم ئەوە بێ کە وەلاّمی هەستە دەروونیەکانی من دەدەنەوە.

١- شێوەکاری فەرەنسی و گرنیگترین نوێنەری رێبازی رۆمانتیزم.

جۆرێك هەستی تایبەت بە نیگارکێشی هەیە کە شیعر و مۆسیقا ئەو هەستە لە شەخسدا بەدی ناهێنن. ئێوە لە نیشاندانی راستەقینەی شتەکان چێژ وەردەگرن. بەجۆرێك کە دەڵێی بەراستی ئەوان دەبینن. لە هەمان کاتدا ئەو مانایەی کە وێنەکان بۆ زیهنیان هەیە، ئێوە شادو سەرگەرم دەکەن.

وێنەی لاپەڕە ١٦

ئەو بیچم و نەخشانەی کە لە زیهن و روانینی ئێوە چۆنیەتی راستەقینەی خۆیان دەنوێنن، وەکو پردێکی خۆڕاگرن کە وزەی خەیاڵی ئێوە لەخۆ دەگرن و دەچنە بەهەستە نامۆ و قوڵەی کە بیچمەکان بۆ ئەوان وەکو وشەکانی خەتی وێنایین. ئەگەر ئەوان وا بیربکەنەوە کە هەرکات بنووس(( قاچ)) یان ((دەست)) و ئەو هەستە لە زەینی من بەدی بکەن کە دەست یان قاچێکی جوان دەبینم، ئەو زۆر خراپ فریویان خواردووە.

هونەر جەبری ماتماتیکی کورتکردنەوەی ژمارەکان یارمەتی حەلی پرسیارەکە بدەن. لەسەر کەوتنی هونەریدا، بەهیچ جۆر قسە لەسەر سادەکردنەوە ناکرێ، بەڵکو ئەگەر بلوێ، زێدەنوێنی و گەورە نوێنی و بەردەوامی هەست لە هەموو رێگاکانی مسۆگەردا لە ئارادایە. شانۆ چییە؟

هونەر یەکێك لە دڵنیاترین شاهیدەکانی ئەو داخوازیەیەکە مرۆڤ پێویستی بەوە هەیە کە لە هەر ساتێك، زیاترین هەست لە دەروونی خۆیدا تاقی بکاتەوە. شانۆ هەموو ئەوانە کۆدەکاتەوە. بەجۆرێك کە هەریەك لەو هونەرانە دەبنە هۆی ئەوەی کاریگەری ئاوێتەی ئەوان قوڵتر هەست پێ بکەین.



# رۆزا بۆنور[1]

## ١٨٩٩ — ١٨٢٢

## Rosa Bonheur

**لە: ((بیرەوەرییەکانی رۆزا بۆنور))**

باوکی(( بۆنور )) ریمۆند[2]، لە وێنەگەرانی دیمەن و زانستی دیمەنەکان، و لە رێرەوانی هانری دۆسەن سیمون[3]، سۆسیالستی کە مال ئەندێش بوو کە هونەرمەندی بەقەشەی((مەسیحییەتی نوێ)) خۆی دەژمارد و لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە مەسیحی وادە دراوی داهاتوو، ئەو جۆرەی کە بۆنور لێرە دەڵێ، ژنێك دەبێت. ئەو بیروڕایانە لە ساڵی ١٩١٠ دا بڵاوکراوە.

من هیچ کات بەو ژنە وێنەگرانەی کە دۆستی منن، پێشنیارم نەکردووە کە ژیانی رۆژانە یاندا یان لە کاتی ئاسایی، جلی پیاوان لەبەر بکەن. بەڵام ئەگەر ئێوە من بەو جۆرە دەبین کە ئەو جلانەم پۆشیوە، بەهیچ جۆر بۆ ئەوە نییە کە داهێناینکم کردبێ. بەڵکوو تەنیا بۆ کارئاسانی لە کارەکانیدا بەو چەشنە جل لەبەر دەکەم. من لە قۆناغێك لە ژیاندا، هەر رۆژم لە قەسابخانە تێپەڕدەکرد، هۆگریەکی زۆریشم ئەسپ هەبوو. کەواتە ئێستا چ شوێنێ لە باخچەی ئاژەڵەکان بۆ لێکۆڵینەوەی حەیوانەکان باشترە... بە ناچارییەوە گەیشتم کە ئەو جلانەی کە هاورەگەزەکانی من کەڵکی لێوەردەگرن، ئاستەنگییەکی بەردەوام بەدی دێنن.

---

١- وێنەگەری فەرەنسی کە زۆربەی بەرهەمەکانی لە وێنەی حەیوانەکانی دەستەمۆ.

(2) Roymond Bonheur

(3) Henri de saint simon

لەبەر ئەوە داوام لە سەرۆکی پۆلیس کرد ڕێگە بدا جل و بەرگی پیاوانە لەبەرکەم بەلاَم ئەو جلەی کە لەبەری دەکەم، تەنیا جلی کاری منە نەشتێکی تر.

ئەو ناو و ناتۆرەی گێژ و بیرکورتەکان لەسەرمنیاندا ناوە، هەرگیز منیان نەرەنجاندووە...

٢ ساڵ لەمەوپێش (٨ ی ئۆکتۆبەری ١٨٩٦)، لە میوانی بنەماڵەی سەڵتەنەتی رووسیە لە پاریس، وەزیری هونەرەجوانەکان دەیەویست کە کەسایەتییە پلە بەرزەکانی هونەری فەڕەنسی، پێ بناسێنن...

من جلێکی مەخمەر رەشی جوانم لەبەر بوو و کلاَوە پەڕدارە بچووکەکەشم لەسەرنا بوو... کە گەیشتە لوور، دلّم دەیهەویست بە هەر نرخێك بێت کلاوە لبادییە خۆڵەمێشەکەی خۆم لەسەربنێم. من تەنیا ژنی نێو گرووپی ئەو پیاوانە نەبووم... هەموو چاوەکان لەمنیان دەڕوانی" نەمدەزانی خۆم لە کوێ بشارمەوە، ئەزموونێکی دژوار بوو. ئەو رۆژ چونکە جلی پیاوانم لەبەر دا نەبوو، نارەحەت بووم.

دڵنیابن راست بەو جۆرەیە کە دەڵێم...

سەرەڕای ئاڵوگۆڕی لە جلەکانم، هیچ یەك لە کچانی حەوا نییە کە زیاتر لە من جیاوازییە وردو درشتەکان بناسێ و ستایەشیان بکات، سروشتی توندوتیژو تائاستێك وەحشی من، هەرگیز دڵی منی لە لێدان بۆ تەواو ژنانە بوونم نەوەستاندووە....

بۆچی بەژن بوونی خۆم شانازی نەکەم؟ باوکم کە ئەویندار و شەیدای مرۆڤایەتی بوو، جارەهایجار بەمنی ئەوت کە ئەرکی ژن، بەرەوپێش بردنی نێژادی ئینسانە و ژن روخساری سەدەکانی داهاتووە. من هەستی مەزن خوازی و بابیی بوونی خۆم قەرزاداری بنەما بیروڕایەکانی باوکمم. کەیف خۆشم کە پەیوەستی ئەوم و تا دوایین رۆژی ژیانیشم پشتیوانی لێدەکەم. جگە لەوە، دڵنیام کە داهاتوو بۆ ئێمەیە.



# جان کۆنستابل[1]

## ١٨٣٨ — ١٧٧٦

## John Constable

**لە: نامەیەك بۆ جای فیشەر**

فیشەر (2)، قەشەی مەزنی کلّیسەی سالیبێری، دۆستی لە مێژینەی جان کۆنستەبڵ بوو. ئەو نامەیە (ڕێکەوتی ٢٣ ی ئۆکتۆبری ١٨٢١ رەنگدانەوەیەکە لە هەستیاری کۆنستەبڵ سەبارەت بەجوانی دیمەنەکانی سروشتی بەریتانیا.

چەندە ئاواتم بوو کە لەسەفەری ماسیگرتنی(( نیوفۆرست)) دا لەگەڵ ئێوە بوایەم! دەبێ چۆن رووبارێك بێت؟ لەگەڵ دەنگی رژانەخوارێی ئاو لە بەنداوی ئاشەوەو... دارەبیەکان، دارەبڕاوە کۆنەکان و رزیوەکان. لەتەدارە قەوزە لێنیشتوەکان. ماڵە خشتینەکان، من ئەویندداری ئەوشتانەم. شکسپیەر(3) دەیتوانی بە هەمووشتێ روخسارێکی شاعیرانەبەبەخشێ، ئەو شاعیرە قسە لە ماڵ و مەسکەنی (تابە)ی بێ چارە لە((ئاغەڵی مەڕەکان)) دەکا. مادام کە من نیگارکێشم، هیچ کات لە کێشانەوەی ئەو شوێنانە ناوەستم. ئەو شوێنانە هەموو کات هۆی شادی من بوون و

---

[1] لە هونەرمەندانی بەرجەستەی بەریتان و کاریگەری دانەر لە بواری وێنەگەری دیمەکانی سروشت.

[2] Fisher

[3] Shakspear

ئەگەر لەگەڵ ئێوەبام، بە دیتنی ئەوەی کە چ شتێك وەسف دەکەن ولە کەنار ئێوە((لە کەنار پیاوێك کە سروشت بێ هودە بارستایی خۆی نیشان نادات)) هەستم بەشادی دەکرد. هەڵبەت من دەبێ ئەوجێیانەی دەست نیشانم کردوون باشتر بکێشمەوە" نیگارکێشی بۆ من واتایەکی ترە... ڕەنگدانەوەی ((بەرەڵڵایی منداڵیم)) و تێکڕای ئەو شتانەیە کە لە کەناری (ستاڤەر) هەیە لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە لە بەستێنی ئێستاور هەبوون بۆ من دووبارە دەکاتەوە. ئەو دیمەنانە لەمندا نیگارکێشێکیان بەدی هێناو من سپاسیان دەکەم" لەراستیدا پێش ئەوەی قەڵەم بگرمە دەست زۆر تر بیرم لە وێنەی ئەو دیمەنانە کردبۆوە.

*وێنەی لاپەڕە ٢٠*



## جان ڕۆسکین[1]
## ١٨١٩ – ١٩٠٠
## John Ruskin

**((بەردەکانی وێنیز )) لەبەشی ٦(( چییەتی گوتیك))**

((بەردەکانی وێنیز )) بەرهەمی راسکین لەساڵی ١٨٥٣ دا بلاّوکراوە، لەکاتێك کە مێعماری((گوتیك))[2] ی وێنیزی ستایەش دەکرد، بیناکانی ڕێنسانسی ئەوێی مەحکەم دەکرد. ڕێبازی گوتیك لە سەدەی نۆزدەش باو و لایەنگری زۆری بووە.

لەناو چوون و بەرەو وێرانی سەرچاوە گرتوو لە جێ گۆرکێ مەکینە و کرێکار لەچاخی ئێمەدا، زیاتر لە هەر بەلایەکی تر، کۆمەڵەی گەلانی لە هەموو شوێنەکانی جیهان بەرەو هەوڵێکی بێ بایەخ، ناپەیوەندیدارو وێرانکار بۆ وەدەستهێنانی ئازادییەکی وەسف نەکراو دەکێشێ.... دەبێ بڵێم کە من توندوتیژی

---

١- نووسەر و رەخنەگری بەریتانی.

٢- Gothic: ڕێبازی بەرچاوی تەلارسازی باکووری ئوروپایە، لە دەسپێکی سەدەی دوازدە هەتا سەدەی شازدەهەم، هەروەها بەشێوازی نیگارکێشی و پەیکەر تاش ئەو چاخەش دەگوترێ. گوتیك شێوازی مێعماری بێنا بەرزو بڵیندەکان بوو و لە بواری مێژوویی جێنیشنی شێوازی رۆمی بوو.

گۆتیك یان هەرجۆری تر لە نەبوونی کەماڵ، لەهەرشوێنێك کە بڕیارگرتنی گەڵاڵە یان ئەندیشەیەك بێ ئەو مسۆگەر نەبوو، ستایشم کردووە.... لە هونەردا، گەورەترین مامۆستایان چاوەڕوانی ئەوپەڕی وردەکار یان لێدەگرێ، کە هەمووکاتیش ئەوە نیشاندەدەن ... بەڵام کەسانی خوارتر ناتوانن ئەو کەمالی وردەکارییە نیشان بدەن، چونکە ئەویەڕی وردەکاری پێویستی بە زانستی کامڵ هەیە دوای ئەمەش ئێمە دەبێ ئەندێشەکانی ئەوان هەر بەو جۆرەی کە پێشکەش بە ئێمەی دەکەن قەبووڵ بکەین .... ولە هەمووئەوانە گرینگتر لە شوێنێك کە ئەندێشەیەك لە ئارادانییە، داوای وردەکاری ناکەین. چونکە ئەوەکاری کۆیلەکانە... ئێمە لەو رۆژگارەدا هەمووکات هەوڵ دەدەین کە ئەو دووانە لە یەك جیا بکەینەوە: کەسێك کە دەمانهەوێ هەمووکات خەریکی ئەندێشە بێت و کەسێکی تر کە هەمووکات خەریکی کارکردن بێت. یەکەمیان بەڕێز ناو دەنێنین و دووهەمیان کرێکار، لە کاتێکدا کە کرێکار دەبێ زۆرکات لەبیرکردنەوەدا بێ وبیرمەندیش زۆرکات خەریکی کارکردن. هەردووش دەبێ پڕ بە مانای، بەڕێزبن. ئێمە هەردووی ئەوانە بە نابەڕێز دەزانین. یەکێ لە وان بە برای خۆی ئیرەیی دەبات و ئەوی تر لە برای خۆی بە بچووکتر دەڕوانی و کۆمەڵگای ئێمە لەبیرمەندانێکی نەخۆش و کرێکارانێکی هەژار پێك دێنن. تەنیا بەکارەکە دەتوانین سافی بە ئەندێشە ببەخشین و تەنیا بە ئەندێشە دەتوانین لە کار شادی بخولێنین" جوداکردنەوەی ئەو دووانە بێ پێشاهاتی ناخۆش مسۆگەر نییە. وابیر دەکەمەوە کە وتەکانی من تارادەیەك روون و ئاشکرابن کە نیشان بدەم توندو تیژی یان نەبوونی کە مالێك کە لەسەرەتای وشەی ((گۆتیك)) ی بە وشەیەکی کەم بایەخ ناساند، ئەگەر بەڕاستی دەرك بکرێ، دەزانین کە یەکێکە لە تایبەتمەندییە بە نرخ و پێویستیەکانی تەلارسازی مەسیحی. وا دێتە بەرچاو لەو کارەدا پێوانێکی دژبە یەك و سەیر ولە هەمان کاتدا راستەقینە هەبێ.



لەگەڵ ئەوەشدا، ڕاستیەکی زۆر گرینگ ئەوەیە کە هیچ شێوازێکی تەرلاسازی ناتوانێ ئەوەندە رەسەن و بەشکۆ بێت کە بتوانین بڵێین کەماسییەکی نییە.

کۆیلەیی کرێکاران دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەشەکانی جۆراوجۆری بینایەك رێك وەکویەك بچن" چونکە سنووری کەمال لە کاردا ئەو کاتە مەیسەر دەبێ کە دەرفەتی پڕۆڤەی ئەنجامدانی کارێك تەنیا بدرێتە کرێکار. بەو جۆرە دەتوانین ئاستی گەندەڵبوونی کرێکار بە نیگایەك بەدەست بێنین و ئەویش بە دیتنی ئەوەی کە ئایا بەشەکانی جۆراوجۆری بینا وەکو یەك وان یان نا، بۆ وێنە ئەگەر لە کاری یۆنانییەکاندا، هەموو سەری ستوونەکان وەکو یەکتر و هەموو ستوونەکان یەکپارچەبن، ئەو نیشانەی بەتەواوی گەندەڵبوونی کرێکارە... یان ئەگەر بۆ وێنە لە کاری گۆتیك گۆڕانکاری بەردەوام هەم لە گەلالە و لەبەڕێوە چوونی کار بدیترێ، نیشانەی ئەویە کە کرێکار تەواو سەربەست کراوە.

# شارل بودلێر[1]

## ١٨٢١ — ١٨٦٧

## Charles Baudelaire

لە بەشی ٢، پێشانگای ١٨٥٩: ((کۆمەڵگای نوێ و وێنەگری)) بۆدلێر کە بە بۆنەی ئەو شیعرانەی کە باسی زۆریان لێ کەوتەوە ((گوڵەکانی دۆزەخ)) (١٨٥٧)، ناسراوە، لە رەخنەگرانی گرینگی هونەری لە پاریس لە میانەی سەدەی نۆزدەهەم بوو ((نادار))ی[2]. وێنەگر لەدۆستانی نزیکی ئەو بوو.

لەو ولاتە وێنەگری سروشت، وەکو شاعیری سروشت، تا ئاستێك وەکو دێوەزامەوایە. زەوقی پاوانخوازی ئێمە بۆ راستەقینەکان .... زەوق بۆ جوانی دادەمرکێنی و خامۆشی دەکا. لە هەر شوێنێك کە تەنیا پێویستە جوانی بدۆزینەوە... خەڵك لە راستەقینەکان دەگەڕێن. ئەو خەڵکە زەوقی هونەریان نییە...لە چوارچێوەی وێنەگەری و پەیکەرتاشیدا، بڕوای بیرمەندان و بەتایبەت لە فەڕەنسە بەو جۆرەیە: (( بەسروشت بڕواو بکەن، من تەنیا بڕوا بە سروشت دەکەم .... لەسەر ئەو بڕوایەم کە هونەر نوسخە هەڵگرتنەوەیەکی وردە لە سروشت و تەنیا دەتوانێت...بەو جۆرە ئەگەر دەرەنجامێکی پیشەسازی بتوانێ ئەنجامێکی وەکو سروشت بە ئێمە بدات، ئەوە دەبێتە هونەری موتڵەق))

ئیلاهەی تۆڵە، پاڕانەوەکانی ئەو کۆمەڵەی بیستووە، ((داگێر))[3] مەسیحی بەڵێن پێدراوی ئەوانە و دواتر ئەوان بەخۆیان ووت: ((چونکە وێنەگەری، گەرەنتییەکی

---

[1] شاعیرو رەخنەگری فەڕەنسی

[2] Nadar لە پێشەنگای پیشەسازی و هونەری وێنەگرییە.

[3] Daguerre لە پێش هەنگاوەکانی هەنەری و پیشەسازی وێنەگری.



تەواوە بۆ وردبینی ... هونەر، وێنەگریە. لەوکاتە بە دواوە، کۆمەڵگای تەوەزەل و نەفرەت ئەنگێزی ئێمە، وەکو ((نێرگز)) هەوڵی دا بە خێرایی سەیری وێنەی خۆی لەسەر لاپەڕەی کانزایی بکات...

من قانع بووم کەڵك وەرگرتنی نادروست لە پێشکەوتنەکانی وێنەگری، لەراستیدا وەکو هەموو ئەو پێشکەوتنانەی کە تەنیا ماددین، یارمەتییەکی فراوانیان بە وێرانی زەوقی هونەری فەڕەنسییەکان داوە... شیعر و پێشکەوتن، دوو پیاوی خۆخوازن کە بە شێوەیەکی غەریزەی نەفرەتیان لە یەکترەو هەرکات رووبەڕوویەك ببنەوە، یەکێ لەوان دەبێ مەیدان چۆڵ بکات . ئەگەر بڕیارە وێنەگری نوێنەرایەتی هێندێ لە چالاکییە هونەرییەکان وە ئەستۆی بگرێ، لە دوای ماوەیەکی کورت، ئەویش بە یارمەتی گەمژەیی خەڵك — هاودەستی سروشتی خۆی — بەتەواوی جێگری هونەر دەبێ و وێرانی دەکا.

کەواتە پێویستە وێنەگری بۆ ئەرکی راستەقینەی خۆی، یانی خزمەتکردنی زانست و هونەر، بگەڕێتەوە... لێ گەڕێن وێنەگری بەخێرایی ئەلبۆمی موسافیران دەوڵەمەندبکات و ئەو وردکاریانە کە لە زەینیدا نەماون بۆی تۆماربکات . لێگەڕێن وێنەگەری کتێبخانەی زیندەوەرزانەکان برازێنێتەوە، حەشەرە وردەکان بە بیچمێکی گەورە نیشان بدات، تەنانەت زانیارەکەمەکانی تیۆری ئەستێرە ناسانیش با بەهێز بکات" بەکورتی، لێگەڕێن و وێنەگری کارمەند و بەردەستی ئەرشیفی هەر کەسێك بێت کە بە هۆکاری پیشەیی، کە خەریکی گەڕانە بەدوای راست بوونی ماددی دیاردەوشتەکان... بەڵام ئەگەر بڕیاربێ وێنەگەری هەنگاوبنێتە ناو هەرێمەکانی خەیاڵ و هەست پێنەکراوی زەین، یان بە هەرشتێ کە بەهای ئەو تەنیا بەو سەبەبەیە کە مرۆڤ شتێك لەرووم و هەبوونی خۆی پێ زیاد کردووە، هاواربە حاڵی ئێمە.

# شارل بودلێر

## ١٨٢١ — ١٨٦٧

## Charles Baudelaire

لە بەشی ١٨ی پێشانگای ١٨٤٦: (( قارەمان پەروەری ژیانی نوێ)) بودلێر لەسەر ئەو بڕوایە بووکە وێنەگەران و پەیکەرتاشان دەبێ بابەتەکانی مێژووی وەلابنێن و لە ژیانی هاوچەرخ بابەت هەڵبژێرن. بیروڕاکانی ئەو لەسەر هێندێك لە وێنەگەرانی دواتری، بۆ وێنەدۆستی نزیکی ئێدواردمانە، کاریگەری هەبوو.

ساتێك بەو مەبەستە بنەمایی و ئەساسییەی خۆمان کە بریتییە لە دۆزینەوەی وەڵامی ئەو پرسیارەکە ئایا جوانییەکی تایبەت لەزاتی هەستە تازەکانمان دا هەیە یان نا، دەبینین زۆربەی ئەو هونەرمەندانەی کە لە کاری خۆیاندا زیاتر سەرنجیان داوەتە ژیانی نوێی ئێمە، خۆیان بە بابەتەکانی گشتی و ڕەسمی — سەرکەوتن و قارەمان پەروەرییە سیاسییەکان دڵخۆش کردووە. بەهەر حاڵ ئەو کارەش بەوردی و ناسکی بە ئەنجام ناگەیینن و تەنیا بۆ دەوڵەتێك کە مووچە دەدا کار دەکەن. بەڵام بابەتگەلێك هەن کە زۆر لەوانە قارەمانانەترن.

شکۆ و زریقەو بریقەی ژیانی ئەو ڕۆمان لەبەرامبەر هەزاران بوونەوەری سەرگەردان — جەنایەتکاران و ژنانی گرفتار- کە لە تاریکی و شوێنە دواکەوتوەکانی شارەگەورەکان دەتلێنەوە، هەموو ئەوانە ئەوە دەسەلمێنن کە تەنیا بەسە چاوەکانمان بکەینەوە تاقارەمانەکانی خۆمان بدۆزینەوە.



وای دابنێن وەزیرێك لە پرسیاری بێ جێی گرووپێکی دژی خۆی وە ئامان هاتووە، سەرنجام دەبینن بۆ یەکەمین جارو بۆ هەمیشەش بە ڕەوانبێژی و غرورێك کە تایبەتی خۆیەتی، نەفرەت و بێزاری لە دژی هەموو بەنەزان و ریاکارەکانی خۆی دەردەبڕێ. شەوی هەمان ڕۆژ لە بولواری ئیتالیایەکان بە چپە ئەو قسانەتان دێتەبەر گوێ: ((ئەوڕۆ لە پەرلەمان بووی؟ وەزیرت دێت؟ خودای من! چ ڕێکو پێك بوو! من هەرگیز گەورەیەتییەکی وەهام لە کەس نەدیبوو! ))

لەبەر ئەوە شتێك بەناوی جوانی نوێ و قارەمان پەروەری نوێ هەیە! کاتێك ئەو قسانەتان لە دەم دێتەدەرێ، شاهیدی ئەوەیە کە ئەو جوانیە تا زەوتاییەتە نەجوانی (( ئاشیلە)) و نەجوانی ((ئاگاممنۆن)) ، بڕوا دەکەن ژیانی شاکارەکانی ئێمە، پڕە لەبابەتی شاعیرانە، بەرزو سەرسوڕهێنەر. دەڵێی هەموومان غەرقی جوانی و سەرسوڕمان بووین، بەڵام هەستی پێ ناکەین.

# گۆستاڤ کۆربێ[1]

## ١٨١٩ — ١٨٧٧

## Gustave Courbet

**لە نامەیەکی بۆ گروپێك بۆ قوتابییەکانی**

گرووپێك خوێندکار کە بە نارِەزایەتی وازیان لە زانکۆی هونەرەجوانەکان هێنابوو، داوایان لە (کۆربێ) کردبوو زانکۆیەکی تر بەرِێوەبەرن کە هیواداربوون دابمەزرێ، لە نامەیەدا کە رێکەوتی ٢٥ی دێسامبەری ١٨٦١ ە، کوربێ ئەو پێشنیارەی رەتکردەوە، بەلاّم رازی بوو تا سالێك لە ژوورێکی بەکرێ دا رەخنە بگرێت و فێر بکات" مۆدێلی ئەو زۆربەی کات وەرزێرێك بوو لەگەلّ حەیوانێکی مەزرا.

خوێندکاران! نیمە و ناتوانم هەمبێ.

من بڕوام وایە کە هەر هونەرمەندێ دەبێ گەورەی خۆی بێ ... ناتوانم هونەری خۆم فێری کەس بکەم.

چونکە بڕوام نییە هونەر فێر بکرێت.

چونکە لەسەر ئەو بڕوایەم هونەر تەواو تاکە کەسییە و بەهرە وشیاوی هەر هونەرمەندێك تەنیا بەرهەمی ئیلهامەکانی خۆی و خوێندنەوەی نەریتەکانی رابردوویە...

١- وێنەگەری بەرجەستە و رێبەری بزووتنەوەی ریئالیزمی فەرەنسە.



بەتایبەت، هونەر لە نیگارکێشیدا، تەنیا دەتوانێ نیشاندەری ئەو شتانەبێت دەیانبینێ و لە نزیکەوە هەستیان پێدەکات.

هیچ سەدەیەك ناتوانێ لە دەرەوەی هونەرمەندانی ئەو سەدەیە بناسرێتەوە... من بڕوام وایە کە هونەرمەندانی سەدەیەك بەهیچ جۆر ناتوانن شتی سەدەکانی پێشوو یان داهاتوو بناسێنن ... واتە من نکۆلّی لە واتای ((هونەری مێژوویی)) کە روانینێکە بۆ رابردوو، دەکەم. هونەری مێژوویی لە بنەڕەتدا هونەرێکی هاوچەرخە. هەر سەدەیەك دەبێ هونەرمەندانی خۆی هەبێ کە ڕاڤەی بکەن و بەداهاتوانی بناسێنن.

هونەرمەندانی راستەقینە ئەوانەن کە قۆناغی خۆیان دروست لەو نوختەوە دەست پێ دەکەن کە سەدەکانی پێشوو پێی گەیشتوون. پاشەکشێ یانی کارنەکردن... بەو هۆیەیە کە کۆتایی هەموو رێبازەکانی کۆن هەمیشە بریتی بووە لە کۆمەلّ گەلێکی بێ بەهاو کەم نرخ.

هەروەها من بڕوام وایە کە وێنەگەری هونەرێکە کە لە نزیکەوە هەست دەکرێ و تەنیا دەتوانێ نیشان دەری شتە هەبوو و راستەقینەکان بێ ... خەیالّ لە هونەردا بریتییە لە دۆزینەوەی کاملّ ترین رێگە بۆ دەربڕینی شتێك کە هەیە، نەك لە خەیالّدا پەروەردەبکرێت یا بخولقێندرێ.

جوانی لە سروشتدایە. لە راستیدا، دەتوانین بەشێوەی جۆراوجۆر ببینین. هەرکە جوانی دەدیترێ، دەبێتە ملّکی هونەریا لە راستیدا ئەو هونەرمەندەی کە توانیویەتی ببینێ. جوانی لەسەر ئەساسی سروشت بەرزتر لە هەموو بڕیار و رێوڕەسمە هونەرییەکانە.

# لیلا کابۆت پیّری

## ١٨٤٨ — ١٩٣٣؟

## Lilla Cabot Perry

**لە : (( بیرەوەرییەکانی کلۆدموونە لە ساڵی ١٨٨٩ تا ١٩٠٩))**

نیگارکێشێکی کۆچ کردووی ئەمریکی بوو، موونە بەتوندی لایەنگری بینین و ئەزموونگەری بوو. لە تیۆری گەرایی هونەری زۆر دەترسا و لەوەی بیروبۆچوونەکانی بکاتە رێبازی خۆی دەپاراست بیرەوەریەکانی پیّری، کە لە ساڵی ١٩٢٧ بلاّوکرانەوە، باشترین بەڵگەی ئێمەیە بۆ بیروڕاکانی ئەو.

ئەو هیچ کات قوتابی قبوڵ نەکرد، بەلاّم ئەگەر هۆگری دەرس گوتنەوە بوایە دەبوو بە مامۆستایەکی بەرز و پاڵنەر. وەبیرم دێ جارێك بەمنی ووت: ((کاتێك دەتەوێ شتێك بکێشییەوە، فەرامۆش کە چ شتێکت لەبەرامبەرە — دار، ماڵ، مەزرا، یان هەرشتێکی تر.

تەنیا بیرلەوە بکەوە کە ئەوە چوارگۆشەیەکی شینە، ئەوە خەتێکی ئەرخەوانییە و ئەو لاکێشەیەکی زەرد، چۆن وەبەرچاوت دێن ئاوا بیانکشێنەوە. دروست بەو رەنگ و بیچمەی کە دەیبینی، تا وێنەگەرێ، ئەو نەخشەی کە لەسەر زەینی هەڵکەندووی، بنوێنیّ)).

پیّری ئەیوت ئاواتە خوازبووە کوێر لە دایك بوایە و دواتر لە پڕبینایی وەدەست هێنابایە و تا بەوجۆرە، یانی بێ ئەوەی بزانێ ئەو شتانەی لەبەرامبەر خۆیدا دەیان



بینیّ چین، وێنەگەری دەست پێکردبایە. ئەو لەسەر ئەو بڕوایە بوو کە یەکەم ڕوانین بۆ بابەت و هەوێنی کار، لەوانەیە راستەقینە ترین و بێگەردترین روانین بێت. لە هەنگاوەکانی دەستپێکردنی وێنەگەری دەبێ زۆربەی رووبەری تابلۆ هەر چەند ناساف و ناڕێکیش بێت، داپۆشێ تا لە هەمان دەستپێکەوە حاڵەت و رەنگ ئامێزی گشتی دیاربێت.

فەلسەفەی وێنەگەری (موونە) ئەوە بوو ئەو شتەی دەیبینیّ، بیکشێتەوە، نە ئەوەی لەخەیاڵی دایە دەبێ بیبینیّ و شتەکە نە بە و جۆرە بە لوولەی تاقیگە لە فەزای دەوروبەری جودا کرابێتەوە، بیبینیّ، بەڵکو دەبێ بە شێوەیەك بێ کە لە بە هەتاو و هەوا جێگرتبێ، لەگەڵ گومبەزێکی شین کە ئاسمان سێبەری بێ.

# مەری کاسات[1]

## ۱۸٤٥ — ۱۹۲٦

## Mary Cassatt

### له نامەیەك بۆ هاریسۆن موریس [2]

له میانەی ساڵەکانی ۱۸۷٤ و ۱۸۸٦ له فەرەنسە گرووپێك له شێوەکاران کەپەیوەندییەکی ئەوتۆیان لەگەڵ یەکتر نەبوو بەناوی ئەمپرەسیونیستەکان[3] ناسران، ۸ پێشانگایان له دەرەوەی پێشانگا فەرمییەکان بەڕێوەبرد. ئەو پێشانگا((سەربەخۆ)) یانه له ئەورووپای رۆژئاوا هەر زوو بوون و بە ئیلهام بەخشی نیگارکێشانی تر و بەو جۆرە، یارمەتییەکی گرینگی لەناوبردنی سیستەمی ئاکادیمیاندا کە نیگارکێشی ئەورووپای له نیوەی سەدەی هەڤدەوە خستبۆ ژێر دەستەلات، کرد. نامەی ١٥ی مارسی ١٩٠٤ی (کەسەت) بۆ (موریس)،

(1) ژنە وێنەگەری ئەمریکی، لایەنگری ئەمپرەسیۆنیزم.

(2) Harrison Morris

(3) Lmpressionism : ناوێك کە (له سەرەتا بەگاڵتە) بەشێوازێك له وێنەگەری کە له دەیەی ۱۸۷۰، له فەرەنسە پێکهات دەگوترێ و بە شێوەیەکی باو بەیەکەمین و کاریگەرترین شۆڕش له ناو شۆڕشەکانی هونەری مـۆدێرن دەگـوترێ. ئەمپرەسـیۆنیزم هـەوڵ دەدات بـەزۆرترین ئاسـتی راسـتەقینە گـەرایی بگـات و لـە ریـێ تـەحلیلی ئەزموونگـەری وردی رەنگـەکان و سـێبەرو روناکییەکانی.



بەڕێوەبەری گشتی ((زانکۆی هونەرە جوانەکانی پنسیلوانیا)) کاردانەوەیەك بوو لەبەرامبەر بەو خەلاّتەی پێی بەخشرابوو.

یەکەمین پێشانگای ئێمە له ساڵی ۱۸۷۹ و نارەزایەتییەك بوو بۆ پێشانگا فەرمییەکان، کۆبوونەوەی نیگارکێشان هەم مەیلی هونەری نەبوو بەڵکو. لەو کاتەوە ئێمە بەناوی ((ئەمپرەسیونیست)) بانگ دەکرێن، ناوێك کە لەوانەیە سەبارەت بە((موونە)) راست بێ بەلاّم بۆ((دێکا)) هیچ مانایەکی نییە.

ئازادی له جیهانی ئەورۆدا یەکەمین بەهرەیە، رزگاری له زوڵمی لێژنەی داوەرەکان، بەهای شەڕکردنی هەیە. بەدڵنیایەوە هیچ پیشەیەك وەکو پیشەی ئێمە تووشی کۆیلەیەتییەکی بەو چەشنە نەبووە. ژێروم (شێوەکاری ئاکادیمست) کە بەدرێژایی ژیانی ئەندامی لێژنەی داوەرانی سەرجەم پێشانگا رەسمییەکان بوو، ماوەیەکی کورت بەر له مردنی وتی ئەگەر((میلە)) [2] لەو زەمانەدا زیندوو بوایە تابلۆکانیم پەسەند نەدەکرد، بەلاّم گرینگ نەبوو جیهان لێهاتووی میلە بە پیرۆز دادەنێ یان نا دەدیت بۆ ئەو جیاوازییەکی نەبوو. وابیردەکەمەوە ئەو وتەیە لێکدانەوەیەکی باشە بۆ ئەو سیستەمە ... کاتێك چەند ساڵ پێشتر له ولاّتی خۆم بووم یەکێ لەو شتانەی زۆر دڵساردی دەکردمەوە ئەوە بوو، دەمدیت ئێمە کوێرانە هەموو گەندەڵیەکانی سیستەمی فەرەنسە کە خۆشیان مەحکوومیان دەکرد و هەوڵیان دەدا لێی رزگار بن، دەمانکردە سەر مەشق.

## جه یمز ئەبۆت مەکنیل ویستلێر[1]

**۱۸۴۳ — ۱۹۰۳**

**James Abbtt mc Neil Whistler**

**له کتێبی: هونەری ناسکی دوژمن داتاشین**

کتێبی وایستلێر که له ساڵی ۱۸۹۳ دا بلاّوکراوه، شیکردنەوەی شکایەتی بەناوبانگەکەی له ساڵی ۱۸۷۸ دژی جان راسکین و تۆمەتەکانیەتی.

هەر بەو جۆرەی که مۆسیقا، شیعری دەنگە، وێنەگەریش شیعری روانینە و ئەو بابەتە هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ هاوئاهەنگی دەنگ یا رەنگ نییە. موزیسیە نه گەورەکان ئەوەیان دەزانی. بێتهۆڤن و ئەوانی تر، مۆسیقایان پۆلّی. بەس مۆسیقا، سەمفۆنیا لەو کلیلەدا و کونسیرت سۆناتاله کلیلەکەی تردا.

ئەو موزیسیە نانە بە دارِشتن و تێکەلاّوکردنی بەجێی نۆتەکان ئاهەنگی ئاسمانیان دەخولّقاند. ئەوەیە ئەو مۆسیقا بێ وێنەیەی که دەبێ له نەغمەی جودا بکرێتەوە (نەغمە خۆی له خۆیدا، شتێکی ئاسایی و سووکە بەلاّم له روانگەی ئەوشتانەی که دەینۆێنی سەرنج راکێشە. وەکو ئاوازەکانی ناوچەیی)

١- وێنەگری ئەمریکی.



هونەر دەبێ سەربەخۆ له هەر چەشنە خۆنوێنی و هەوڵ بۆ سەرنج راکێشان بێ" هونەر دەبێ پشت بە خۆی ببەستێ بۆ چاو وگوێچکەکان خۆش بێت. بێ هیچ تێکەلاّویەك لەگەڵ ئەو هەستانەی تەواو بیگانەن، وەکو فیداکاری، بەزەیی، خۆشەویستی، ولاّت پەرستی و شتی تر، هیچ یەك لەوانە، هیچ جۆرە پەیوەندییەکیان لەگەڵ هونەر دا نییە. لەبەر ئەوەیە من پێدادەگرم کارەکانم ئارایشت و هاوئاهەنگی ناوبنێم. بۆ نموونە وێنەی دایکم که له ((ئاکادمیای سەڵتەنەتی)) یە بەناوی ((ئاریشت له خۆڵەمێشی و رەش)) دا نمایش کراوە، لەبەر چاوبگرن، ئەو وێنەیە لەرایستیدا هەر ئەوەیە" بۆ من وەکو وێنەی دایکم سەرنج راکێشە " بەلاّم بۆ خەڵکی ئەو وێنەیە دەتوانێ چ گرینگییەکی هەبێت؟ .

# ئۆگۆست رۆدان[1]

## ۱۸٤۰- ۱۹۱۷

## August Rodin

**لە: ((وتوووێژەکانی)) لەگەڵ ((پۆل گەیسل))**

ئەو بیروڕایانە کە لە ساڵی ۱۹۱۱ هاتوونە سەرزمان، نیشاندەری ئەوەن کە رۆدێن لە لێکدەرەوەکانی ئەو ئەندێشەنا نەریتیە بوو کە جوانی یا ناحەزی بەرهەمێکی هونەری لە((تایبەتمەندی)) یا((راستەقینە))ی زاتی خویدایەتی.

کۆمەڵەی خەڵك بە ئاسانی وا بیردەکەنەوە ئەو شتەی کە بە بڕوای ئەوان ناحەزییە بابەتێکی گونجاو نییە بۆ هونەرمەند و نواندنی هەر شتێك کە لە سروشتدا جوان نایەتە بەر چاو ئازاردەرە، قەدەغەیە. ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە کە تووشی دەبین.

ئەو شتەی کە بە شێوەیەکی باو لە سروشتدا بەناحەزی ناو دەبرێ دەتوانێ لە هونەردا گەلێك جوان بێ. ئێمە لە داوێنی راستییەکاندا، ئەوەی کە نارێك و ناساغە، بۆنی نەخۆشی وبێ هێزی و رەنج دەدا و یان بێ نەزمە — کە نەزم مەرج و نیشاندەری سلامەتی و تواناییە — بە ناحەز ناوی دەبەین. پشت کووڕ ناحەزە، هەرکەسێ گیربێ ناحەزە، جلی شڕنا حەزە.

١- پەیکەرتاشی فەرەنسی.



بەلام لێگەرێن با نووسەر یا هونەرمەندێکی گەورە کەڵك لەو ناحەزیانە وەرگری، ئەوەدەم ناحەزی زۆر زوو بیچمی خۆی دەگۆڕێ.

بۆ هونەرمەندی گەورە هەر شتێك لە سروشتدا تایبەتمەندی خۆی هەیە... ئەو شتەی کە لە سروشتدا بە ناحەزی دەژمێرین زۆر جار تایبەتمەندی و ئاکارێکی باشتری هەیە لەو شتەی کە بە جوانی دەزانین. چونکە لە ئازارەکانی روخساری نەخۆشێك، لە هێڵەکانی دەم و چاوی مرۆڤێکی خراپ، لە هەموو خواری و گەندەڵی و رووبەوێرانییەکان دا، راستەقینەی دەروون زیاتر لەوەی کە لە رێك و پێکی و سلامەتیدا هەیە، خۆی دەنوێنێ و دەدرەوشێتەوە. لەو جێگەوە کە تەنیا هێزی تایبەتمەندی و ئاکارە لە هونەردا وەفریانی جوانی دەکەوێت، زۆر جار وا روودەدات کە ئەو شتەی لە سروشتدا ناحەزترە، لە هونەردا جوانترە. لە هونەردا هیچ شتێ ناحەز نییە، مەگەر شتێك کە بێ تایبەتمەندی و رواڵەت بێ، یانی شتێ کە هیچ راستەقینەیەکی دەروونی یان دەرەکی نانوێنێ.

هەر شتێك کە درۆیان دەستکردە، هەرشتی کە زیاتر جوانە تاپڕمانا، هەر شتی کە زوو رەنگ و رووی دەگۆڕێ و ساختەیە، هەر پێکەنینێکی بێ هۆ، هەر لەنجەیەکی بێ هۆ، هەمووی ئەوانە کە لەڕووی عادەت و نەریتەکانن، بێ رۆح و دوور لە راستین، تەنیا خۆ نواندنێکن لە باشی و جوانی. بە کورتی ئەو شتانەی کە درۆینەن، لە هونەردا ناحەزن.

# یورس – کارل هویزمانس

## ١٨٤٨ – ١٩٠٧

## [1]Joris – Karl Huysmans

**له: ((ئاسن))**

هویزمانس نووسەری توندرەوی رۆمانی دژ بەزێدەرۆیی لە سروشت گەرایی ((بە پێچەوانەی ویست[1])) بەیەکێ لە رەخنەگرانی گرینگی هونەری پاریس لە کۆتایی سەدەی نۆوەدە دەژمێردرا. نووسراوەی ژێر هەڵبژاردەیەکە لە رەخنە هونەرییەکانی ئەو، لە ژێرناوی ((هێندی کەس[2])) (١٨٨٩) لە بیناسازیشدا رەوشی ئێستا هەروایە.

مێعمارەکان بەرهەمی زۆر پوچ و بێ نرخ چێدەکەن کە بەشەکانی لە هەموو سەدەکانی پێشوو وەرگیراوە. بەڵام بەگشتی پوچترین جۆری لاساکردنەوە کە دەتوانین وێنای بکەین، نیشان دەدەن. راستییەکی ئاشکرایە: سەدەی ئێمە هیچ مێعمارییەکی نەخوڵقاندووە و هیچ رێبازێکی تایبەتی نییە... راستییەکی گۆمان

(1) Against the Grain

(2) Certaines



هەڵنەگرتر ئەوەیە کە ((بەرد)) تا ئێستا کە رەستەی سەرەکی بینا دەژمێردرێ بەڵام لەبەر دووپاتە بوونەوەی زۆر، نرخی خۆی لەدەستداوە... لەگەڵ ئەوەشدا لە وانەیە لە چاخی ئێمەدا بیناکان کە نیشاندەری چالاکی خەمناکی، فریوکاری و پارەن، بە بیچم ئەو بەرهەمە سەخت و تاریکانەن کە وەك تازە خۆیان دەنوێنن، لێردا مەبەستمان لەو کەرەستەی کە باسی دەکەین((ئاسن)) ە.

لە کاتی دەسەڵاتداری لویی فیلیپەوە(١٨٣٠- ١٨٤٨) – تا ئێستا گەلێك جار هەوڵ بۆ کەڵك وەرگرتن لە ئاسن بۆ بیناکان ئەنجام دراوە بەڵام ... بچمێکی نۆێ نەخوڵقاوە.

## ڤینسنت ڤان گۆگ[1]

## ١٨٥٣- ١٨٩٠

## Vincent van Gogh

**له نامەیەك بۆ براكەی تیۆ**

ئیئۆ كە كارمەندی دەلاڵێكی هونەری لە پاریس بوو، هاندەری ئەساسی هەست و باری ئابووری وێنسان بوو. ئەو نامەیە لە ڕێكەوتی ٣٠ی ئاوریلی ١٨٨٥ لە ماڵی باوكی لە نوین نووسراوە.

من هەولّم داوە جەخت لەسەر ئەو بابەتە بكەم هەر ئەو خەڵكەی لە كاتی خواردنی پەتاتەكا لە ژێر روناكی چرادا، هەر بەودەستانەی دیخەنە نێوان قاپی خواردنەكەیان، زەویش هەڵدەكەنن" كەواتە قسە لە ((كارێكی دەستییە)) و ئەوەی كە ئەو خەڵكە چلۆن بە كرداری ڕاست خواردنی خۆیان وەچنگ هێناوە.

١- وێنەگەری پۆست ئەمپرەسیو نیستی هۆڵەندی.



من ویستوومە تا ڕێورەسمی ژیانی جیاواز لەگەڵ ژیانی ئێمە، یانی خەڵكی شارستانی بخەمەڕوو. كەواتە، چاوەڕوان نیم هەمووان ئەوەیان پێ خۆش بێ یان ستایشی بكەن...

پێم وایە هەڵەیە ناسكییەكی سوننەتی ببەخشمە وێنەی دیهاتییەك. ئەگەر وێنەی لادێی بۆنی گوشت، دووكەڵ یا هەڵمی پەتاتەبدا، بە هیچ جۆر شتێكی ناساخ و نائاسایی نییە. ئەگەر گوەڕێك بۆنی تەرس بدا، تەواو ئاساییە" ئەگەر مەزرابۆنی گەنمەشامی گەیشتوویان پەتاتە یا سەماد بدا، تەواو ئاسایی و ساخە، بە تایبەت بۆ خەڵكی شار.

# ڤێنسنت ڤان گۆگ

## ١٨٥٣ — ١٨٩٠

## Vincent Van Gogh

**له نامەیەکی بێ ڕێکەوت بۆ تیۆ**

من هەر ئێستا دەگەڕێمەوە سەر ئەو ئەندێشانەی کە پێش ناسینی ئەمپرەسیونیستەکان لە مێشکمدا بوون. بەلامەوە سەیر نییە ئاخۆ ئەگەر ئەپرەسیونستیەکان هەروا بەزوویی ڕەخنە لە شێوازی کارەکەم بگرن. چونکە من هەوێنی کارەکانم لە ئەندێشەکانی «دیلاکراو ا» وەرگرتووە نە لە ئەندێشەکانی ئەوان. لەبەر ئەوەی لە جیاتی هەوڵدان بۆ نیشاندانی ئەو شتەی کە بەچاوی خۆن دەیبینم، بە شێوەیەکی هەڵبژاردە، لەڕەنگ بۆ دەربڕینی ئەندێشەکانە کەڵك وەردەگرم. من دەمەهەوێ وێنەی یەکێ لە دۆستانی وێنەگری خۆم کە هەردەم لە دونیای خەونە شیرینەکانی دا دەژی و کاتێك کە بولبول نەغمە دەچڕێ (چونکە ئەو سروشتی وەهایە) بکێشمەوە. ئەو پیاوێکی سورکارەیە. من دەمەوێ خۆشەویستی و ستایشی خۆ بەرامبەر بە ئەو لە وێنەکەمدا نیشان بدەم. کە واتە، لەسەرەتادا، وێنەکەی هەر ئەو جۆرەی کە هەیە، بەو پەڕی سرنجەوە دەکێشمەوە. بەڵام کارەکە ئێستا تەواو نەبووە. بۆ کۆتایی پێهێنانی، هەر ئێستا بە مەیل و زەوقی خۆم لە ڕەنگ بەهرە وەردەگرم کاڵ ڕەنگی قژەکانی بە چەشنێکی زیادە لە رادەنیشان دەدەم، تەنانەت لە سێبەری نارنجی و زەردی لیمویی کاڵیش کەڵك وەردەگرم. لە پشت سەری، بەجێگای کێشانەوەی دیواری ژوورێکی ئاسایی یان بێ نرخ، تا ئەو پەڕ دەکێشمەوە. ڕووبەرێکی سادە بە ڕەنگی شینی تۆخ، بەشکۆیەکی هەرچی تەواو و بە دانانی قژەکاڵەکانی لەسەر ڕووبەرێکی شینی تۆخ، کاریگەرییەکی ڕەمزاوی بە جێدێڵم. هەروەکو ئەستێرەیەك لە قوڵایی ئاسمانی شیندا.



# پۆل گۆگان[1]

## ١٨٤٨- ١٩٠٣

## Paul Gauguin

**له نامەیەك بۆ جی: ئێف ویلومسێن[2]**

جی. ئێف ویلومسێن، وێنەگەری هۆڵەندی و یەکێك لە ئەندامانی گرووپی گەوگەن لە بریتانی بوو. گەوگەن ئەو نامەی لە پاییزی ساڵی ١٨٩٠ دا پێش سەفەر بەرەو دەریاکانی باشوور نووسی .

من بڕیاری خۆمم گرتووە. من بەرەوتاهیتی، دورگەیەکی بچووك لە ئۆقیانووسدا دەڕۆم. لەوێ هەرکەس دەتوانێ هەموو پێداویستەکانی ماددی ژیانی بێ پارە دابین بکا. من دەمەوێ هەموو چارەرەشییەکانی پێشووم فەرامۆشکەم، دەمەوێ بێ هیچ گەورەیی و شکۆیەك ئازادانە کاربکەم. دەمەوێ هەر لەوێ بمرم و هەرلەوێ فەرامۆش کرێم. لە ئوروپادا خەریکە چاخێکی ترسینەر بۆ بەرەی داهاتوو دروست دەبێ: دەستەڵاتداری زێڕ. هەموو شتێك گەندەڵ بووە، تەنانەت مرۆڤەکانیش، هونەریش. لەوێ لانێکەم، لە ژێر ئاسمانی شینی هاوینی، لەسەر خاکێکی جوان و بە بەرەکەت، هەرکەسێکی تاهیتی تەنیا پێویستە دەستەکانی بەرزکاتەوە تاوەکو بژێوی خۆی وەدەست بێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ کارنەکات. لە کاتێکدا لە ئوروپا پیاوان و ژنان ئینسان گەلێکی هەژارن و تەنیا پاش کار و هەوڵێکی بێ وچان دەتوانن لە ناو سەرماو برسیەتیدا زیندوو بمێنن. بە پێچەوانەوە خەڵکی تاهیتی، دانیشتوانی شادمانی بەهەشتی نەناسراوی ئوقیانوسن و تەنیا جوانییەکانی ژیان دەبینن. لای ئەوان ژیان بەمانای خۆشەویستی و خوێندنە... هەرکات لە ژیانی ماددیم دا بە سامان بگەم، دەتوانم لەوێ خۆم تەرخانی کاری گەورەی هونەری بکەم، ڕەها لە هەموو ئێرەییەکانی هونەرمەندانە، بێ هیچ نیازێك بەکاری سووك و بێ نرخ.

١- وێنەگەری پۆست ئەمپرسیونستی فەرەنسی.

(2) J.F. Willumsen

## لويى سوليڤان[1]

## ١٨٥٦ — ١٩٢٤

**له : ((باڵاخانەی فەرمانگەکان لە روانگەی هونەرییەوە))**

سولیڤان پێش نووسینی ئەو ئەندێشانە لەو وتارە لە ساڵی ١٨٩٦ دا، چەندین تەلاری هەور بڕ بۆ وێنە((وین رایت)) و ((گارانتی)) تەواوکردبوو.

تەلارسازانی ئەو وڵاتە بەرەنگاری شتێکی نوێ لە ژێر ئەو ئاسمانە شینەدا بوونەتەوە... داخوازی بۆ دروست کردنی بینای بەرزی دایرەیەکان.

دایرە و ئۆفیس (دەفتەرکاری) بۆ ئەنجام دانی دانووسانەکانی بازرگانی پێویستن" داهێنان و تەکمیل کردنی ئاسانسۆر (مصعد) ە خێرایەکان، ئەو هاتوچۆیانەی کە زەمانێك دژوار و ماندووکەربوون، ئاسان و رەحەت کردۆتەوە. هاتنە ئاراوە و پێشکەوتنی پۆلاسازی، رێگەی بۆ دروست کردنی بینای بەرز، مەحکەم، دڵنیاو هەرزان خۆش کردووە. زێدەبوونی بەردەوامی دانیشتوانی شارەکان و بە دوای ئەویشدا چڕبوونەوەی ناوەندی شارەکان و بەرزبوونەوەی نرخی زەوی، دەبێتە هۆی زیاد بوونی نهۆمەکان ...بەوجۆرە بیچمێك لە بینای بەرزبەناوی بینای نوێی دامەزراوەکان بەدی هاتووە.

---

١- تەلاسازی ئەمریکی.



مەسەلەیەك: چۆن دەتوانین بەوکۆمەڵە نەزۆکە ....بەو بەرەنگارییە سەرسوڕهێنەرو پڕ هەرواو بێ کوتاییە، ناسکی و جوانی شێوە بەرزەکانی هەست، زانیاری و فەرهەنگی ببەخشین؟ تایبەتمەندی سەرەکی بینا بەرزەکان چییە؟... بەرزن. گرینگی ئەو بەرزیە بۆ هەستی هونەرمەند، ئەو لایەنە بزوینەرەیە کە گوڕو جۆشێکی پێدەبەخشێ... دەبێ لە هەرسانتی مەتری دا بە هەستێکی لە خۆبایی و سەربەرز و جۆشێکی تەواوە بەرەو ئاسمان بڕوا، تاوەکو سەراپا یەکپارچە بێتە بەرچاو.

هێندێك لە رەخنە گران... ئەوتیورەیان پێش خستوە کە نموونەی راستەقینەی تەلاری هەور بڕ، ستوونێکی نەریتییەکە لە بناغە، بەدەنە و سەرستوونەکان پێکهاتووە...

تیۆریسیەنەکانی تر، لەسەر بنەمای گریمانەیەك لەسەر سێ کۆچکەی سروشت، هونەرو جوانی و دڵنیابوون لە یەکیەتی ئەو سێ بەشە دەدوێن...

ئەوانی تر کە لە دونیای گیاکان بەدوای نموونە و پاساوێك دان بۆ خۆیانن، پێداگری ئەوەن کە ئەو گەڵاڵانە دەبێ (سیستماتیك) بن. ئەوان ئاماژە بەداری کاج، ریشەنەرم و ئەستورەکانی، بەژنی راست و گەڵای سەوزو پەخشانی دارەباڵابەرزەکان دەکەن. بەوجۆرە، ئەوان دەڵێن کە گەڵاڵەی بینا بەرزەکان دەبێ بەو جۆرە بێت : بە شێوازێکی ستوونی لە ٣ بەشدا.

گرووپێکی تر کە زیاتر بەهێزێك هەستیارن تاناسکی و جوانی سێ کۆچکەیی، لەسەر ئەو بڕوایەن کە وەها گەڵاڵەیەك، دەبێ بە یەك تەکان بنیاتبنرێ — وەك بڵێن لەلایەن ئاسنگەرێك یان ژووبیتەری بەتوانا.

من بە داخێکی زۆرەوە دەبێ بڵێم کە لەگەڵ ئەو رەخنەگرانە جیاوازی بیروڕام هەیە، چونکە هیچ ئاماژەیەکیان بە ناخی بابەتەکە، یانی حەقیقەت و فەلسەفەی پتەو و نەگۆڕی هونەری مێعماری نەکردووە... بیچم لە سروشتدا، بەردەوام لە ژیانی

دەروونی، حاڵەتی دەست لێنەدراوی حەیوان، دار، باڵندە و ماسی دەدوێ. بیچم وەها تایبەت، روون و ئاشنایە کە زۆر سانا دەڵێین سروشتیە و دەبێ بەو جۆرەش بێ. ئەو یاسایە هەموو ئەو شتانەی سیستماتیك یا ناسیستماتیکن وەخۆ دەگرێ ... کە شێوە بەگوێرەی کارە... ئێستا ئایا ئێمە دەتوانین لە هونەرەکەماندا سەرپێچی لەو یاسایە بکەین؟ ئایا ئەو مەبەستە ئەوەمان نیشان نادا کە دوونهۆمی ژێرەوەی بینا بەرزەیەکان تایبەتمەندییەکی گونجاویان لەگەڵ پێداویستیەتایبەییەکانی خۆیان هەیە، یان ئەو نهوومانەی لەسەریەکین و ئۆفیسەکان لەوانەدا هەموو بەیەك جۆرن، دەبێ بە شێوەیەکی نەگۆڕ بەردەوام بن؟ بەڵام ژووری نهۆمی هەرەسەروشی (ژیرسواڵەتەکە) ئایا نابێ بیچمی دەرەکی و تایبەتی خۆی هەبێ؟ بەمجۆرەیە کە بە شێوەیەکی سروشتی بینایەك پێکهاتوولە ٣ بەش. ئەو بینا سێ بەشییە، لە هیچ تیۆر و هێمایان لۆژیکێکی خەیاڵی بەرهەم نایەت.



## جۆرجیا ئۆکیف [1]

## ١٨٨٧- ١٩٨٦

## Georgia Okeeffe

**لەکتێبی ((ستیگلێتز[2]: وێنەکانی لەو تێگەیشتن))**

ئۆکیف لەساڵی ١٩٠٨ دا لەگەڵ ئالفرێدستیگلێتز بوو بە ئاشنا. یەکەمین پێشانگای خۆی لەساڵی ١٩١٦ لەگەڵ یەکەی ئەودا بەڕێوەبرد. ئەوان لەساڵی ١٩٢٤ زەماوەمدندیان کرد. ئەو بیروڕایانە دوای مەرگی ستیگلێتز، لە ساڵی ١٩٤٩دا بلاۆکرانەوە.

ستیگلێتز لە قۆناخێك گەورە بوو کە پیشەی وێنەگری لە تەمەنی لاوێتی خۆی دا بوو. کاتێك کە خەریکی خوێندن لەبەشی ئەندازیاری مکانیك لە زانکۆی پۆلی تەکنیکی بێرڵەن بوو، کاری وێنەگری دەستپێکرد... ئەو زوو بڕیاری دا کە لە وێنەگریدا ببێت بەیەکێ لە ناودارەکان، هەر بەو هۆیەش وێنەکانی خۆی بۆ هەموو پێشانگاکانی وێنەگری دەنارد تا هەموو ئەو خەلاّتانەی کە لەو کاتدا لە زۆر شوێنی جیهان دەبەخشران، وەدەست بێنێ.

---

(1) وێنەگری ئەمریکی و لە بەرجەستەترین پێشهەنگاوانی هونەری مۆدێڕنی ئەمریکی.

(2) Alfred,Stieglitz وێنەگری ئەمریکی (ئەو بە باوکی وێنەگری مۆدێڕن ناودەبەن)

گەرچی ئەو وێنانەی کە ئەو دەیگوت لە لایەن هونەرمەندان و وێنەگران زۆر ستایش دەکران، بەڵام وادیاربوو لەسەر ئەو باوەڕەش بوون کە وێنەگەری قەت ناتوانێ وەکو هونەرێك قەبووڵ بکرێت. ستیگلێتز دژی ئەوەبوو، چونکە خۆی بە شێوەیەکی سروشتی کەسێکی تێکۆشەر بوو، هەوڵەکانی خۆی بۆ ناساندنی وێنەگری وەکو هونەرێك دەسپێکرد- نەبۆ شەخسی خۆی، بەڵکو بۆ خودی وێنەگەری...نیگارکێشەکان زۆرجار دەیانگوت خۆزگە ئەو شتانەی کە ئەو وێنەی لێگرتوون، ئەوان بیانکێشاباوە، بەڵام ئەو هیچ کات حەسرەتی ئەوەی نەبوو ئەو تابلۆیانەی ئەوان کێشاویانەتەوە، بۆ وێنەی نەگرتوون. لە ساڵی ١٨٩٠ کاتێك ستیگلێتز٢٦ ساڵە بوو، خوێندنی لە ئەوروپا تەواو کرد. گەڕاوە ئەمریکا و چالاکی جیددی خۆی لە بواری وێنەگری دەسپێکرد.ئەو دوای ساڵەها تێکۆشان لە ئاکامدا بەو ئەنجامە گەیشت کە بۆ بە فەرمی ناسینی وێنەگری وەکو هونەر، کاری هاوبەش کاریگەرتر لە کاری تاکە...

گرووپی The Photo Secession(جودا خوازەکانی وێنەگری) لە ساڵی ١٩٠٢ پێکهات... وستیگلێتز ڕێبەریان بوو. ئەو گرووپە لە ساڵی ١٩٠٥ بە بەڕێوەردنی پێشانگاکانی شێوەکاری لە گەریەکی بچووك بە ناوی ((٢٩١)) کارەکەیان دەسپێکرد... لەو شوێنەدا یەکەمین قۆناخەکانی هونەری مۆدێرن نمایش دەکران.

مامۆستایانی «کۆمەڵەی خوێندکارانی هونەر» منیشیان وەکو خوێندکاری تر بۆ دیتنی یەکەمین پێشانگای وێنەگەری «ڕۆدێن» بۆ گەلەری((٢٩١)) نارد. زۆر بەباشی وەبیرم دێکە کاتێك ئەو خوێندکارانەی لەگەڵ من بوون سەبارەت بە تابلۆکان لەگەڵ ستیگلێتز دەستیان بە قسەکرد، ئەو چەندە بە توڕەیی، بەرگری لە خۆی دەکرد.



# هێنری ماتیس[1]

## ١٨٦٩ — ١٩٥٤

## Henri Maitsse

لە: «یاداشتەکانی وێنەگەرێك»

ئەو وتارە کە لە ساڵی ١٩٠٨ نووسراوە، تەواوترین بەیاننامەی ماتیسە سەبارەت بە هونەرەکەی و نیشاندەری گواستنەوەی ئەوە لە قۆناخی دەسپێکی فوریزمەوە[2] بۆ دەورانی گەشەپێدانی دوای فویزم.

زۆر جار کە دەمەوێ کاربکەم، لە پێشدا بەهەستی سەرەتایی خۆم سەبارەت بەرەنگەکانی دەورووبەرم دەستپێدەکەم. تاچەند ساڵ لەمەوبەر ئەو ئەنجامە دەسپێکە بۆ من بەس بوو- بەڵام ئەگەر ئەوڕۆش هەر بەوشێوەیە رازی بومایە، تابلۆکانم ناتەواو دەبوون، هەستە تروسکە دارەکانم وەلایەك دەنا، چونکە ئەو هەستانە نەیاندەتوانی بە تەواوی حاڵەتەکانم بێننەسەر زمان و لەوانە بوو رۆژی دواتر، بە هیچ جۆر نەزانم کە چ مانایەکیان بۆم هەبووە. من دەمەوێ بەو حاڵەتە کە بۆ ئافراندنی تابلۆیەك دەبێ هەستەکانم چڕ بکەمەوە. هەر ئەو هەستەی کە لە وەدا وێنەکان دەخوڵقێن.

---

[1] وێنەگەری فەڕەنسی.

[2] Faur: واتایەکە کە بەرێباز و لایەنگرانی بزووتنەوەیەکی وێنەگەری کە لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم لە فەڕەنسە گەشەیکرد، دەوترێ. ئەو رێبازە لەسەر بنەمای کەڵك وەرگرتنی زۆر لە رەنگە روون و بێگەردەکانە کە زۆر کات بەشێوەی دڵخوازبەکاردێ نو وەکو زۆریەك لە رێبازەکانی تر بەتانەو بچووك دیتن ناوی" وەحشییەکان" نیان لەسەر نابوون. لە رێڕەوانی ئەو رێبازە — ماتیس، مارکۆت، وێلامنیك، رائوودرێن دەتوانین ناوببەین کە زۆرتر یان نزیك ساڵی ١٩٢٨ رێبازی خۆیان گوڕی.

دوو ڕێگا بۆ دەربڕینی حاڵەت و شتەکان هەیە: ڕێگەی یەکەم نیشاندانیان هەر بەو جۆرەی کەهەن و ڕێگای دووهەم نیشان دانیان بە ڕوانینێکی هونەرمەندانە. بە وەلانانی نیشاندانی ئۆبژکتیوی جوڵە، دەتوانین بە بەرزترین ئاستی جوانی بگەین.

وا دابنێن من دەمەوێ فەزای ناوەوەی ژوورێك بکێشمەوە: لەپێشمدا مەکتەبەیەك هەیە کە هەستی ڕەنگێکی سووری ڕوونم دەداتێ. لەرەنگی سوورێك کەڵك وەردەگرم کە ڕازیم دەکا. یەکسەر ئەوە، پێوەندییەك لە نێوانی ئەو ڕەنگە سوورە و سپێنی پەردەی تابلۆکەم چێ دەبێ. ئێستا ئەگەر نزیك سوورەکە سەوز بکەم و ژێری ژوورەکەش بەزەرد نیشان بدەم، دیسان دەبێ لە مابەینی ئەو سەوزە، زەردی و سپێنی پەردەی تابلۆکەم پێوەنەدیەك هەبێت کە من ڕازی بکات. بەڵام ئەو ژێررەنگە زۆرانە یەکتر لاواز دەکەن. کەواتە پێویستە ئەو توخمە زۆرانەی کە کەڵکیان لێ وەردەگرم دەبێ لە هاوسەنگییەکی وەها دابن کە یەکتر لاوازنەکەن. بۆ ئەو کارە دەبێ هەموو ئەندێشەکانم بەکاربێنم. پێوەندی مابەینی ژێرڕەنگەکان دەبێ وەها بەئەنجام بگات کە یەکتربە هێزبکەن. تێکەڵاوییەکی نوێ ڕەنگەکان بەدوای تێکەڵاوی دەسپێکدا دروست دەبێ کە هەست و لێکدانەوەی من تەواوتر نیشان دەدا... من ناتوانم کۆیلە ئاسا سروشت کۆپی بکەم. دەبێ سروشت بۆ خۆم شی بکەمەوە و وەکو گیانێك بیکەمە ڕووحی تابلۆیەکەم. کاتێك پێوەندی هەموو سێبەرەکان بدۆزمەوە، ئاکام هاوئاهەنگییەکی زیندوو لە ژێر ڕەنگەکان دەبێت، هاوئاهەنگییەك کە زۆر لە دروستکردنی ئاهەنگێکی مۆسیقایی دوور نییە.

ئەو شتەی من لە رۆئیادا دەی بینم هونەری هاوسەنگی، پاکی و هێمنییە، بێ هیچ گیروگرفت و پەشێوییەك، هونەرێك کە دەتوانێ بۆ هەر مێشکێکی بیرمەند — چ بازرگان و چ نووسەر- ئارام بەخش و سوکنایی هێنەری رووح بێت.

هەر وەکو کورسییەکی کە شەخس بۆ رەهایی لە ماندوویەتی پاڵی تێدا دەداتەوە.



## ڤاسیی کاندنیسکی [1]

## ١٨٦٦ — ١٩٤٤

## Wassily Kandinsky

سەبارەت بە مەعنەوییەت لە هونەردا، لە بەشی ٥،((کاریگەری ڕەنگ)) کاندنیسکی بەو ئاواتە بوو کە بەهونەرەکەی چاخێکی مەعنەوی نوێ بۆ ئینسانی ئەورووپی دەسپێکا. ئەو بیروڕایانە یەکەم جار لە ساڵی ١٩١٢ دا بڵاوکرانەوە.

ئەگەر ڕوانینتان لە دەوری قوتوویەکی ڕەنگی ئاوی (مائی) لە گەڕدابێ، دوو شت ئەزموون دەکەن. یەکەم کاریگەرییەکی تەواو فیزیکی هەست پێدەکەن، واتە چاو لە جوانی و تایبەتمەندییەکانی تری ڕەنگ چێژ وەردەگرێ. بە هەستێکی شادی و ڕازی بوون دەگەن. هەروەکو چۆن خواردەمەنی ناسێکی کارامە تام لە خواردنێکی بە لەزەت دەکا. چاو هاندەدا هەر وەکو چۆن زمان لە کاتی تام کردنی خواردنێکی پڕ داو و دەرمان چێژ وەردەگرێ. بەڵام دوایی زمان ساردو ئارام دەبێتەوە، وەکو ئەوەی کە پەنجەمان بە سەهۆڵ داهێنابێ. ئەو هەستکردنە فیزیکیانە لە بواری زەمانیەوە کورت خایەنن. هەروەها سەرپێیین و ئەگەر بێ ڕوح

١- وێنەگەری ڕووسی (سۆڤیەت)

داخراو بمێنێتەوە هیچ کاریگەرییەك لە دوای خۆیان بەجیٚ ناهێڵن.

هەر ئەو جۆرەی کە ئێمە لەکاتی پەنجەکێشان بەسەر سەهۆڵ دا هەست بە ساردی دەکەین، بەڵاٚم هەرکە پەنجەمان دووبارەگەرم بێتەوە هەستی ساردی فەرامۆش دەکەین. کاریگەری فیزیکی رەنگیش بە جۆرێکە هەرکە چاومان لیٚ هەڵبریٚ، فەرامۆشی دەکەین. لەلایەکی ترەوە هەروەك چۆن ساردی فیزیکی سەهۆڵ کە ئەگەر پەنجەمانی زیاتر لەسەر رابگرین، هێندێك هەستی ئاڵۆزتر و لە راستیدا زنجیرەیەك لە ئەزموونەکانی دەروونناسی لە ئێمەدا دەورووژینی، کاریگەری رواڵەتی رەنگیش لە وانەیەبیێت بە ئەزموونێك.

ئێستا دەگەینە ئاکامی دووهەم کە لە روانینی رەنگەکان بەدی دێت: کاریگەری دەروونناسی رەنگەکان.

رەنگ، لەرەیەکی مەعنەویش لە ناو ئێمەدا چیٚ دەکا و کاریگەری فیزیکی تەنیا بەوهۆیە گرینگی هەیە کە هەنگاوێکە کە بەرەو ئەولەرە مەعنەوییە.

بەگشتی، رەنگ راستەو خۆ کاریگەری لەسەر رووح دادەنێت. رەنگ تابلۆی کلیلەکانە، چاوەکان کلیلی پیانۆ و رووح خودی پیانۆیە بە گەلێك وایەرەوە. هونەرمەند ئەو دەستەیە کە دەیژەنی و ئاگادارانە پەنجە بەسەر کلیلەکانی دادێنیٚ و لەرەکانی لە رووحدا بەدی دێنیٚ. کەواتە روونە هاوئاهەنگی رەنگەکان دەبیٚ لە دەرەنجام داجەخت لە لاوانەوەی رووحی مرۆڤ بکات.



## فیلیپۆ توماسۆ مارینێتی [1]

## ١٨٧٦ — ١٩٤٤

## Filippo Tommaso Marinetti

**لە: ((بونیاد و بەیاننامەی داهاتووگەرایی))**

بەشوێن مارینێتی دا لە ١٩٠٨، بەیاننامە وەکو ئامرازێکی باو بۆ بڵاوکردنەوەی بیروڕا تازەگەرییەکانی سەدەی بیستەم بەکارهێنرا.

ئێمە ویستە سەرەتایەکانی خۆمان بە هەموو ئینسانەکانی سەرزەوی رادەگەیێنیی:

١- ئێمە دەمانهەویٚ خۆشەویستی بە مەترسییەکان، نەریتی زۆرکارکردن، بوێری و جەسارەت و... ستایش بکەین و شکۆیبەخشین....

٢ — تا ئێستا ئەدەبیات جۆش، خەوتن و بیٚ حەرەکەتی بیرمەندانەی ستایشکردووە. ئێستا ئێمە دەمانهەویٚ بزووتنەوەی هێرش کەرانە، بیٚ خەوی و بیٚ قەراری، راکردن، بازدانی پڕ مەترسی، مست و زەبرلێدان ستایش و پیرۆز بکەین.

(1) شاعیر و نووسەری ئیتالیایی و بنیاتنەری شێوازی فوتۆریزم.

فوتۆریزم (Futurism) : بزووتنەوەیەکی هونەری ئیتالیاییە کە لە ساڵی ١٩٠٩ دا لە لایەن فیلیپۆ توماسۆمارنێتی دامەزرا. ئەو بزووتنەوەیە هەوڵی دەدا کە هونەری ئیتالیا لە رابردوو رزگار بکا و بناغە و بنەماکانی دامەزراو بروخێنیٚ و مەزنی و جوانی ناسی مەکینە و بەشە بزوێنەرەکانی لە بەرامبەر شاکارە قەبووڵ کراوەکانی سوننەتی رابەگەیێنیٚ

٣ – ئێمە رادەگەیینین کە شکۆی جیهان بە شێوەیەکی نوێ لە جوانی – جوانی خێرایی – دەوڵەمەند بووە. سەیارەیەکی کێ برکێیی، کە بە بۆرییەکانی وەکو ئەومارانەی کە بە نەفەسێکی تەقێنەرەوە رازاونەتەوە... سیارەیەکی کێ بەرکێیی کە دەڵێ لەسەر باروت بەرەو پێش دەخشێ، جوانترە لە سەرکەوتنی سوماترا.

٤- لە هەوڵ و خەباتدا چیتر جوانی نابینرێ بێ مۆری پەلامار هیچ شاکارێك بوونی نییە، دەبێ پەلامار بێ بۆ سەر هێزە نەناسراوەکان، تا ناچاریان بکات بکەونە بەرپێی ئادەمیزاد....

٥- ئێمە شەڕ – تەنیا دیاردەی پاك و خاوێنی راستەقینەی جیهان – نیزامی گەری، ولاَت پەرستی، کارە تێکدەرەکانی شوێنەران، ئەو ئەندێشە جوانانەی کە بکوژن و هەروەها بچەك دیتنی ژنان ستایش دەکەین.

٦- ئێمە مۆزەخانە و کتێبخانەکان لە ناودەبەین و دژی ئەخلاق گەرایی، بەرامبەری ژن و پیاو، رەسەنایەتی بەنرخ، شەڕدەکەین.... لە ئیتالیایە کە ئێمە ئەو فەریادەسەرنگون کەر و هەژێنەرانە بەدەنگێکی بەرز رادەگەیینی، تا بەو جۆرە داهاتوو بنیات بنێن، چونکە ئێمە ئیتالیا لە خراپی ئەو مۆزەخانە بێ ئەژمارانە کە ولاَت بە گۆڕستانە بێ ئەژمارەکان دادەپۆشن، رزگار دەکەین.

مۆزەخانە، گۆڕستان، ... ئەوانە بەراستی یەکێکن... ستایش کردنی وێنەیەکی کۆن یانی ناشتنی هەستەکانمان لە تابووتدا، لە جیاتی هەڵرشتن یان بە هەموو هێز و تواناوە.....

بەساڵاچووترینی ئێمە ٣٠ ساڵانەیە، کەواتە ئێمە لانی کەم دە ساڵ دەرفەتمان هەیە کاری خۆمان ئەنجام بدەین. کاتێك بە تەمەنی ٤٥ ساڵی گەیشتن، لێگەڕێن ئەوانی تر – کەسانی لاو و بە جەسارەت تر بێن و وەکو پێش نووسێکی بێ کەڵك ئێمە باوێژنە ناوتەنەکەی خۆڵەوە.



# پیت مۆندریان[1]

## ١٨٧٢ – ١٩٤٤

## Piet Mondnian

**لە: ((هونەری تەشکیلی و هونەری تەشکیلی بێگەرد))**

ئەو وتارە لەساڵی ١٩٣٧ دا بلاَوکراوە. نموونەیەکی باڵای هەوڵدانە بۆ راڤەکردنی تیۆرییەکانی جواناسی بەزمانی نوسین.

ئەگەرچی هونەر لە بنەڕتدا، هەمیشە و لەهەر جێیەکدا بەیەك شێوەیە، وەلێ دوو رێبازی ناکۆك لەگەڵ مرۆڤایەتی بۆ راڤەکردنی بەشێوەگەلی جۆراوجۆر هەیە. مەیلی یەکەم هەوڵ دەدا بۆ ئافراندنی جوانی گشتی راستەوخۆ و مەیلی دووهەم بریتییە لە دەربڕینی هەستی شەخسی بە چەشنێکی جوانی ناسانە... یەکەم راستی هەر وەکو خۆی و دووهەمیان راستی بەشێوەکی زەینی دەدەخا. هەوڵی دووهەم بە دەربڕینێکی تاکەکەسی کۆتایی دێت کە نایاب جوانی دادەپۆشی.

سەرەڕای ئەوە، هەر دووتوخمی دژبەیەك (گشتی و تاکەکەسی) بۆ وروژاندنی هەست پێویستن. هونەر دەبوایە رێگاچارەیەکی راست بدۆزێتەوە.... بۆ هونەرمەندگەڕان بەدوای گەیشتن بەتاك رەهەندی لە رێگای راگرتنی هاوسەنگی لەبەینی ئەو دوو توخمە دژ بە یەکدا، هەوڵێکی هەمیشەیی بووە و دەبێ ... تەنیا کۆسپ لە

[1] وێنەگەر و تیۆر یسیەنی هۆڵەندی.

هونەردا، بریتییە لە گەیشتن بە هاوسەنگی لە بەینی ئوبژکتیو و سۆ بژکتیودا... هونەر بەرەبەرە ڕێبازەکانی وێناکردن بۆ خۆی دەپاڵێوی و بەو جۆرە لە نێوانیاندا پەیوەندی چێ دەکا. بەوجۆرە لە چاخی ئێمەدا دوومەیلی ئەساسی هەیە: یەکێ لە وان لایەنگری مەجاز و وێناکردنە و ئەوی تریان دژی ئەوەیە. لە کاتێکدا کە یەکەمیان بیچمی کەم تاکورت ئاڵۆزو تایبەت بەکاردێنێ، دووهەم لە بیچمیی سادە، پوچەڵ و لە کۆتاییدا لە هێڵی ڕەهاوەرەنگی بێگەرد کەڵك وەردەگرێ. ئاشکرایە کە دووهەمیان (هونەری غەیرەمەجازی) دەتوانێ ئاسانتر لە هونەری مەجازی خۆی بە تەواوی لە زاڵ بوونی ڕیهنییەت رزگار بکات.



# ئەندرێ برێتۆن[1]

## ١٨٩٦ — ١٩٦٦

## Andere Breton

**لە: ((سوریالیزم چییە؟))**

یەکەمین بەیانامەی سوریالیزم لە ساڵی ١٩٢٤ بلاّوکراوەو دووهەمیش لە ساڵی ١٩٣٠ دا کە لە ساڵی ١٩٣٤ بە سێهەمین مانینفیستۆ دەژمێردرا. گەرچی بزووتنەوەی سوریالیزم خۆی بۆ ئازادکردنی تاك تەرخان کرد، بەلاّم برێتۆن دا مەزرێنەری سوریالیزم، هەم ئەخلاق گەرابوو و هەم زۆر بە توندیش دەستەلاّتدار و فەرمانی بکەن و نەکەنی دەدا. لەبەر ئەوەی زۆرجار ئەندامانی گرووپەکەی بەکافر ناو دەبرد بە ((پاپای سوریالیزم)) ناودەبرا.

ئێمە ئێستاش لەژێر دەستەلاّتی لۆژیك دا دەژین" بەلاّم میتۆدەکانی لۆژیك، ئەورۆ تەنیا چارەسەری ئەو کێشانە دەکەن کە گرنگییەکی پلە دوویان هەیە. ئەقڵیەتی رەها کە ئێستاش لە ناو ئێمەدا باوە، ڕێگە نادا جگە لەو جۆرەی کە بە شێوەیەکی دیاریکراو پێوەندیان بە ئەزموونی ئێمەوە هەیە، لێکی بدەینەوە. لەلایەکی ترەوە ئامانجە لۆژیکییەکان لە ئێمە دوورن. پێویست ناکا بڵێین تەنانەت ئەزموونیش سنووری خۆی هەیە. ئەزموون لە ناو قەفەسێکدا بەدەوری خۆیدا دەسوڕێ و هەرچی

[1] شاعیرە نووسەر و تیۆرسیەنی فەڕەنسی .

زەمان تێدەپەڕێ، رزگارکردنی دژوارتر دەبێ. تەنانەت ئەزموونیش پەیوەندی بە یەکسەر بەکار هێنانیەوە هەیە و فکری ساغ دەپارێزێ. لە ژێرناوی شارستانییەت، بە بەبیانووی پێشکەوتن، هەموو ئەو شتانەی کە بە هەڵەیان دروست خورافات یان خەیالاّتیان پێ ئەوترێ، لە مێشك و ئەندێشەماندا وەلانراون" هەر گەرانێکی نائاسایی بەدوای حەقیقەتدا فەرامۆش کراوە. ئەمە تەواو بە هەڵکەوت بووە کە بەم دوایانە لایەنێك لە ژیانی مەعنەوی — کە بەبڕوای من گرینگترین لایەنیەتی — بایەخی پێدراوە و وای بۆ چوون کە ماڵئاواییمان لێ کردبێ. هەموو ئیمتیازی ئەو داهێنانە دەبێ بە فرۆید بدەین. لەسەر بنەمای ئەو داهێنانە خەریکە باوەڕیك چێ دەبێ کە هێزی لێگەڕین، فیکری و مێشکی مرۆڤ والێدەکات کە بە لەبەرچاوگرتنی راستیە وردو درشتەکان درێژە بە لێگەڕینی خۆی بدا. رەنگبێ هێزی خەیاڵ ئێستا مافەکانی خۆی وەربگرێتەوە. ئەگەر لە قولاّیی مێشك و فکری ئێمەدا هێزی سەیروسەمەرە هەبێت کە بتوانێ بە هێزە رواڵەتییەکان شتێ زیاد بکا و سەرکەوتوانە کێبەرکێیان لەگەڵ بکا، تەواو بە قازانجی ئێمەیە کە ئەوان بەو ئاراستەیەدا ببەین و دواتر، ئەگەر پێویست بێ لۆژیك و بەلگە هێنانەوەیان دەستەمۆ بکەین... من دەمەوێ بێزاری لەو شتە سەرسوڕهێنەر و بەربلاّوانە پوچەڵ بکەومەوە ...بە کورتی، سەرسوڕهێنەر هەمووکات جوانە، هەر شتێ کە سەرسوڕهێنەرە جوانە، لە راستیدا، تەنیا سەرسوڕهێنەر جوانە. ئەوەی کە سەبارەت بەو شتە خەیاڵیانە شیاوی ستایش کردنە ئەوەیە کە ئیتر خەیاڵی نین: تەنیا شتە واقیعییەکان بوونیان هەیە.



# فریدا کاهلۆ

## ١٩١٠ — ١٩٥٤

## Frida Kahlo

**لە نامەیەك بۆ نیکۆلاس مورەی** [1]

کاهلۆ هاوسەری دیەگۆ ریڤێرا[2]، نیگار کێشی دیوارەکان، لەساڵی ١٩٣٨ دا لەگەڵ ئاندرێ برێتون ئاشنابوو. برێتون بۆ بەرێوەبردنی چەندکۆڕ و دیتنی لیئۆن ترۆتتێسکی — کومۆنیستی شار بەدەرکراوی رووسی — بۆ مەکزیك هاتبوو. کاهلۆ کە بە تامەزرۆی بینینی ئەوەوە هاتبوو، بەلاّم برێتۆنی وەکو شەخسێکە خۆ نوێن، دزێو و لەخۆبایی هاتە بەرچاو ئەو نامەیە لە رێکەوتی ١٦ی فۆریەی ١٩٣٩دا نووسراوە و شیرۆڤەی پێشانگای پاریسی دەکات کە برێتون بۆ کاهلۆی رێکخستبوو.

ئەو پێشانگایە بەگشتی شێواوە... کاتێك کە هاتم تابلۆکانی هێشتا لە گومرگ بوون، چونکە برێتونی حەرامزادە زەحمەتی هێنانیانی نەدابوو بەرخۆی. هەر بۆیە ناچارمام چەند رۆژ وەکو سێکی گەمژە سەبر بکەم. تا سەرەنجام لەگەڵ ((مارسێل دۆشان)) — تەنیا کەسێك لە ناو گرووپە گێژەکەی سوریالستەکان کە دەیتوانی لە سەرپێ خۆی بوەستێ ئاشنا بووم. ئەو زۆر زوو تابلۆکانی وەرگرتەوە و

[1] Nickolas Muray

[2] Diego Riveia. نیگارکێشی مەکزیکی کە بەرچاوترین بەرهەمەکانی نیگارکێشی سەر دیوارەکانی کە زۆربەیان بابەتی سیاسی و کۆمەلاّیەتیان هەیە.

هەولّی دا گەلەریەکم بۆ بدۆزێتەوە. سەرەنجام گەلەریەك بەناوی ((پیەرکول)) پەیدا بوو کە قەبوولّی کرد پێشانگایەکەم لەویّ بەڕێوە بچیّ.

چەند رۆژ لە مەوپێش برێتون بەمنی وت کە شەریکی((پیەر کول)) تابلۆکانی منی دیتوەو وتویەتی تەنیا دەتوانیّ دوانیان لە پێشانگادا دابنیّ، چونکە ئەوانی تر بۆ خەلّك((ناسایی و هەژینەرن)) (لەوکاتەدا) حەزم دەکرد بیکوژم و بیخۆم. بەلاّم بە ئەوەند لە پێشانگا ماندوو وبێزارم کە دەمەویّ هەچی هەیە لەناوی بەرم و پێش ئەوەی شێت بم ئەو پاریسە ویرانبووە بەجیّ بێلّم... نازانی ئەو خەلّکە چ جانەوەرێکن. قێزم لییّان دەبێتەوە. ئەوانە بەواتە وەها((ژیر)) و کەمتەرخەمن چیتر ناتوانم تەحەمولیان بکەم ... بەسەعات لەناو((کافە)) یەك دا دادەنیشن و پشتی خۆیان گەرم دەکەن و بیّ وچان لە((هونەر)) ، ((فەرهەنگ)) و ((شۆڕش)) و ئەوشتانە دەدوێن، خۆیان بە خودای جیهان دەزانن. خەیالّی بیّ مانا و پوچ لە مێشکیاندا پەروەردە دەکەن و بەو تیۆرانەی کە هەرگیز بەدی نایەن هەوا ژەهراوی دەکەن ... من هەرگیز نەمدیوە کە دیەگۆ( ریڤێرا، مێردەکەی) یان ئێوە کاتی خۆتان بەو قسەگەمژانە بە فیرۆبدەن. هەربەو هۆیەیەکە ئێوە پیاوانی راستەقینەن و نە((هونەرمەندانی)) بیّ نرخ و بیّ کەلّك.



# ماکس بێکمان

## ١٨٨٤ — ١٩٥٠

## Max Bekmann

**لە: ((سەبارەت بە وێنەگەری من))**

نووسراوی ژێر بەشێکە لە ووتاری لۆژیکی ژوئیەی١٩٣٨ لەندەن.

بە بڕوای من هەموو شتە گرینگەکانی هونەر، هەمووکات لە قولّترین هەستەکانی مرۆڤ لەمەڕ ڕازی هەبوون سەرچاوە دەگرن. خۆناسی بزوێنەری هەموو ڕەوتە واقعی و ئۆ بژکتیوەکانە. هەر ئەو((خۆ))یەیە کەمن لە ژیان و هونەری خۆم دا بەدوای دا دەگەڕێم. ئافڕاندن لە هونەردا بۆ گەیشتن بە خۆناسیە، نەبۆ خۆ خافلاّندن بۆ گۆڕانگایە، نەبۆ کایەکردن. هەر ئەو گەڕان بۆ((خۆ)) یەیە کە ئێمە لەو ڕێگابیّ کۆتاییەدا بەرەو پێش دەبات کە هەموو دەبیّ بیگرینە بەر.

من لە بنەڕتدا هەمووکات دژی ئەوە بووم هونەرمەند سەبارەت بە خۆی یان کارەکەی بدویّ. ئەمڕۆ نە خۆ خوازی و نە هەستی پوچ بوون هانم نادا لەو بابەتانە بدوێم کە نابیّ لێی بدوێی. بەلاّم جیهان لەگێژاوێکی وەهادا پەلەقاژە دەکا و هونەر وەها سەرگەردان و سەرلێشێواوە کە من دوای سی سالّ بیّ دونیای جوانی ژیان، ناچارم لە قاوغی خۆم بێمە دەرتا ئەو ئەندێشانەی بەزەحمەتێکی زۆر لەو سالاّنەدا لە مێشکمدا پەروەردەم کردوون، بۆ هەمووان دەری ببڕم.

گەورەترین مەترسی کە هەڕەشە لە کۆمەلّگای مرۆڤایەتی دەکا، بەکۆمەلّ ژیانە. لە هەمووجێییەك هەولّ دەدریّ تا شادی و ڕێورەسمی ژیانی مرۆڤ تائاستی ژیانی مۆریانە بێننە خواریّ. من بە تەواوی بوونمەوە دژی ئەو هەولاّنەم...

هەر لەبەر ئەوەیە چوومەتە ناو دیاردەی ((تاك)) یا بەواتایەکی تر((کۆیەتی تاك)) و تێدەکۆشم لە هەر ڕێگەیە کە وە دەری ببڕم ونیشان بدەم کە تۆ چیت؟ من چیم؟ ئەمانە ئەو پرسیارانە بەردەوام ئازارم دەدەن و یان لە وانەیە دەورێکیش لە هونەرەکەم دابگێڕن.

## جاکسۆن پۆلۆك[1]

## Jackson Poilock

**لە: ((وێنەگەری من))**

ئەو بیروڕایانە لە ساڵی ١٩٤٧دا نووسراون، پۆلاك سێپای وێنەگەری ئەوسا وەلاناو بەجێی ئەوەی قوماش لە چوار چێوەبدا، لەسەر زەوی رای خست. پۆلاك دەیگووت تەنیا رەنگ بەسەر پەردەدا ناپرژێنێ، بەڵکو شتێکی واقعیی لە سەرووی فەزای پەردەکە نیشان دەدا.

وێنەگری من لە سێ پایەوە سەرچاوە ناگرێ. من هیچ کات پێش دەستپێکردنی تابلۆ، قوماش لە چوارچێوە نادەم، بەڵکو پێم باشترە لەسەر دیوارێکی رەق و تەق یان لەسەر زەوی بەبزماری دایکوتم. یانی پێویستیم بە رووتەختێکی رەق هەیە، کەواتە لەسەر زەوی راحەت ترم. لە بارودۆخێکی وەهادا هەست دەکەم لە تابلۆ کە نزیککتر بوومەوە، یانی بوومە بەشێك لە تابلۆکەم. چونکە دەتوانم بەدەوریدا بگەڕێم و کاربکەم بەکردەوە لە ناو تابلۆیەکەدا بم. ئەو شێوەیە وەك وێنەگەری زیخی سوریستەکانی رۆژئاوایە.

١- وێنەگەری ئەمریکی، لەپێش هەنگاوانی Action Panting .



من هەروەها لە کەرەستەکانی باوی وێنەگەری وەکو سێپا، پالێت، قەڵەم موو و... خۆم دەپارێزم، شیش، ماڵە، چەقۆ و رەنگی ئاوەکی روون یان رەنگی خەست لەگەڵ زیخ، وردەشوشە یامەتریالی تر بە باشتردەزانم. من هەرکات لە ناو تابلۆدام، نازانم چ بکەم، تەنیا پاش ئاشناییم لەگەڵ تابلۆیەکەدا دەزانم چیم کردووە. هیچ ترسێکم لەوە نییە لە تابلۆیەکەمدا ئاڵوگۆڕێ پێك بێنم یان وێنەکە لە ناو ببەم و... چونکە تابلۆ بۆ خۆی ژیانی خۆی هەیە، هەوڵ دەدەم ژیانی تابلۆکە خۆی دەرکەوێ، هەر کە لە تابلۆیەکەم دابڕێم شتێکی بێ سەروبەری لێدەدەچێ ئەگەر نا، لە تابلۆدا هاوە ئاهەنگییەکی بێگەرد و دان و ئاڵوگۆڕێکی ساکار هەیە و تابلۆیەکی باشی لێ بەدی دێت.

سەرچاوەی وێنەگەری من ویژدانی بێدارمە. رووکردنە وێنەگەری من وەك رووکردنە هێڵکاریم، وتە راستەوخۆ بێ هیچ خوێندنەوەیەکی پێشوو. هێڵکارییەکانم بە وێنەگەرییەکانمەوە بەندن بەڵام بۆ ئەوان نین.

## رۆمار بیەردێن[1]

## ١٩١١ — ١٩٨٨

## Romare Bearden

**لە: دوو هەڤپەیڤین**

لەهەڤپەیڤینێك لە ساڵەكانی ١٩٨٣ و ١٩٨٦ لەگەڵ (( میرد شوارتێزمەن )) [2]، بیەردین لەو هۆكارە هونەریانە دوا كە لە كاروئەندێشەكانی ئەودا كاریگەر بوون.

میرۆن شوارتیزمەن (ش): كەواتە كۆلاژ[3] بێ بڕیاری بێشوو و زۆر زوو بیچمی خۆی وەردەگرێ. رۆما نبەردێن (ب): ئەرێ، وەكو مۆسیقای جازوایە" لە پێشدا ئاهەنگە كە چێ دەكەن. دوایی بێ بڕیار و ئامادەكاری پێشوو، بەشێوەی كۆتایی خۆی ئامادەی دەكەن. وابزانم ((مانە)) بوو كە گوتی ((تابلۆ تەواو نابێ بەڵكو لە ئاستێكدا بە ویستی خۆتان دەیوەستێنن)). مەبەستی ئەوە بوو، ((ئێ، یانی تابلۆ لەژێر چاودێری دایە)) جاری وایە لەوانەیە وابێش بێت دوای ئەوەی سێ یەكی كار (كێشانەوەی تابلۆ) تەواو ببێ وبلێم: دەزانم ئەوەی دەمەوێ پێی دەگەم. وا هەست

(1) وێنەگەری ئەمریكی.

(2) Myron Schwartsman

(3) Coilage :جۆرێك لە وێنەگەرییە كە لەو دا توخمەكانی دوو رەهەندی لە رێگای دالكاندن، برین، كاغەزە براوەكان، پارچە و وردە شتی دیكە لە سەر لاپەڕە بەیەكەوە دەچەسپێن و لەگەڵ بەشەكانی كێشراوە تێكەڵاو دەبن.



دەكەی كێشانەوەی تابلۆ، باش بەرەو پێش دەچێ و دەبێ هەموو شتەكانتان لە دەستدابێ. هەر ئەو جۆرەی كە ((كارل هولتی[4])) رۆستم دیگوت: ((وێنەكەت زوو دامەخە، تادوایین كات تابلۆكە هەر ئاواڵە بهێڵەوە، چونكە دەتوانی هەر گۆڕانێكی بەسەردا بێنی)). یانی بە ئاستێك دەگەن كە وادێتە بەرچاو كە هەموو توخمەكان لە جێگای خۆیاندان، یانی رەنگ و بیچمەكان جێگای خۆیان دۆزیوەتەوە. لەوكاتەدا دەتوانن تابلۆكە وەلابنێن.....

ش: رۆمار چ شتێك یەكەم پریشك بەدی دێنێ؟

ب: باشە، بیرەوەرییەكان هەن، بەڕاستی لەگەڵ منیان. سەیرە بیرەوەرییەكان بوونیان هەیە، بۆ وێنە ئایا بەرهەمی ((ڤێرمیەر[5])) (نۆژەنكردنەوەی تابلۆی concert) لەسەر دیوار دەبینن؟ من دەڵێم: ((ئەرێ، شتێكی وەكو ئەوەم دیتەوە، وەها و ئەوەها بوو)). چونكە بەبڕوای من، كارێكی هونەری، هەوێنی خۆی لە كارێكی تری هونەری وەردەگرێ، بەڵێ من لە شوێنی وەكو ئێرە بوومە. هەر بەو هێمنی، بێ دەنگییە. چووم بەرەو ئەو كولانەوە تیشكی داوشیت.

ئەو خەڵكە(خەڵكی زەمانی ڤێرمیەر) هەر بەشێوەیە بەرەپێش چوون و خەڵكی مە كلێنبێرگ[5] (باكووری كارولینا، شوێنی لە دایك بوونی بیەردێن) هاتوون بۆ ئێرە، ماوەیەكی كورت ماونەتەوە و ئێستاش شتێكی تر لێرەیە.

من: چاوێك بە بابەتی پەیوەندییەكاندا بخشێنن. ئەو بابەتە لە شێوەكاریدا چ مانایەكیان بۆ ئێوە هەیە؟

(4) Carl Holty

(5) Jan, Vermeer. وێنەگەری فەڕەنسی كە سەرنجی دەدا بە واقیع گەرایی و بارۆخەكانی ئاسایی ژیان. روناكی سروشتی لە تایبەتمەندییەكانی كارەكانی ئەون.

(5) Meck Lenburg

ب: لە باسکردنی پێوەندییەکان دەبێ زۆر هۆکاری جۆراوجۆر لەبەرچاو بگرین، یا ئەوانەی کە بەڕوالەت جۆراوجۆرن، لەو پێوەندییەدا کە نەخشی تابلۆیەك چۆن پێك دێت، دەبینین بۆ وێنە، بەڕای من هاوکێشی فەزا، هێڵ و هید. هەموو شتەکان جۆرێك هەماهەنگیان هەیە ... بۆ وێنە، کاتێك وێنەگەرێکی چینی لە چاخی کەونینەدا لە دار و تاشە بەردەکانی دەڕوانی، جۆرێك یەکیەتی لەگەڵ ئەوان هەست پێدەکرد. من وابیردەکەمەوە ئەو پێوەندیانە یەکێك لەو بابەتە گرینگانەن کە((ماتیس)) لە چۆنیەتی بەرەو رووبوونەوەی وێنەگەرێك لەگەڵیان، ئافڕاندنی بەرهەمێك دەدوێت، چونکە ئەو پێوەندیانە بەردەوام لە گۆڕان دان. لە ( مۆزەخانەی)[1] کلویستێر نیگارەکانی سەر دیواری ئیسپانیای کۆنم دیت و پیکاسۆ لە زەینمدا پەیدا بوو. لەتەکان و پەیکەرەکانی ئەفریقایی دا، هەرشتێك بیچمێکی زۆر جوان وەخۆ دەگرێت. کە هەر شتێکیش بیچمێکی جوان پەیدابکا، وێنەکە باش دەبێت. ئێوە بیچمی پێ دەبەخشن و زۆر نیگەرانی شێوەی ئاناتۆمی لەش نین، ئەگەر ئەوکارە بکەن و هەموو شتەکان بەیەکەوە هاوئاهەنگییەکی دروستیان هەبێ، ئەوکات تابلۆیەکتان هەیە. رواڵەتەکان زۆر جار فریومان دەدەن. هێندێ جار پێویستە ئەوە فەرامۆش بکەین، چونکە لێرە لە جیهانێکی تردا دەژین. لەبەر ئەوە بەسانایی دەتوانین وا بیر بکەینەوە کە ئەو (تابلۆیانە) هیچ شتێك نیشان نادەن.

کارەکانی ڤێرمیەر لەبەر چاوبگرن. سەروبنایان بکەن، ئەبستراکتی تەواو و راستەقینەیان تێدا بەدی دەکرێ. بۆ وێنە گنجی جلەکان“ تابلۆیەکە سەراو بن کەن شتێکی تردەبینن. پێوەندییەکی قوڵ، ئەوە مانای ئەبستراکتە. خەڵك وابیردەکەنەوە کە ئەبستراکت بەو مانایەیە کە بیچمی شتەکان بە شێوەیەکی وێنەیی لەناو تابلۆدا بونیان نەبێ، کەواتە، وشەی ((نانمایشی)) راسترە تا ((ئەبستراکت)) چونکە ((پۆسەن)) و((ئەنگێر)) یش هونەرمەندانی ئەبستراکت. مەسەلە ئەوەیە کە

[1] Nonrepresentional



هونەرمەند لەگەڵ ئاڵوزی و بشێوی بەرەنگارە. هەموو هەوڵی هونەر لە ئاراستەیەکدایە کە چۆن ئەو ئاڵۆزی وبشێویە رێکبخات؟ ... لەوانەیە ئەگەر بە شێوەیەکی هێمایی بڕوانین. ئاڵۆزی و بشێویەك گەورەتر لە(( دۆزەخی دانتی[2] )) لە جەهەننەمدا هەبوونی نەبێت. دانتێ لە دۆزەخی خۆی تووشی ((ڤێرژیل))[3] دەبێ (....) ئەو گێژ و سەر لێشێواوە. ((ڤێرژیل)) دەڵێ: ((تۆرێنوینی دەکەم...)) بە بڕوای من ئەو وەکو هونەرمەندان وایە. ئەوە یارمەتییەکە و دەیەوێ بزانێ بارودۆخ چۆنە ... جۆرێك نەزم و رێك و پێك بوون. ئەو لە گوناه و شتی تری لەو بابەتانە دەدوێ. بەڵام پێویستی بە رێنوینی هەیە.

کەواتە بە بڕوای من سەبارەت بە هونەرمەندیش هەربەو جۆرەیە.

[2] Dante in Inferno
[3] Virgila

# رۆی لیختێن ێشتاین[1]
## لە دایك بووی ١٩٢٣
## Roy Lichtenstein

**لە: «پاپ ئارت[2] چییە؟»**

ئەو و تووێژە لەگەڵ جین ئار. سوینسن[3] لە ساڵی ١٩٦٣دا، لەکاتێك دایە کە«کچێك لە کاتی خنکاندا[4] » ی لیختێن ئیشتاین بلاۆبکراویەوە.

**جین. ئار سوینسۆن (س): هونەری گشتی چییە؟**

رۆی لیختێن ێشتاین (ل): نازانم. وابیردەکەمەوە بەهرە وەرگرتن لە هونەری بازرگانی کراو وەکو سەردێڕی بابەتێك بۆ وێنەگەری. پێشتر بە زەحمەت دەمانتوانی تابلۆیەکی وێنەگەری پەیدابکەین ئەوەندە کەم نرخ بێت هیچ کەسێك ئامادە نەبێ هەڵیواسی. شتێك کە هەموو لێی بێزار بوون، هونەری بازرگانی کراو بوو" بەلاّم وادیارە ئەو بێزارییە ئەوەندەش بەهێز نەبوو.

(س): ئایا هونەری پۆپ ئارت بێ نرخ وشیاوی سووکایەتیە؟

---

١- وێنەگەری هونەری پۆپی ئەمریکی.

٢- بە هونەری گشتی و هونەری گەلیش وەرگێڕدراوەتەوە. Popart

[3] Gene .R. Swenson.

[4] Drownig girl



ل: بەبڕوای من هونەری پۆپ بەرەنگار بوونە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی شەرمهێنەر و پڕ مەترسی کلتوری ئێمە، ئەو شتانە کە لێیان بێزارین" وەلێ کاریگەری قوڵێشیان لەسەر ژیانی ئێمە هەیە. من وابیردەکەمەوە لە سەردەمی((سێزان[5])) بەولاوە، هونەر لە رادەبەدەر خەیاڵی و ناواقیعی کراوە. کەڵك وەرگرتن لە هونەر... پێوەندی لەگەڵ جیهان، رۆژبەرۆژ زیاتر بەرەو پسانە.... جیهان هەبوونێکی دەرەکی هەیە، هونەری پۆپ لە دەروون دەروانێ. وادیارە تەنیا دەوروبەری جیهانی قەبووڵ کردووە. من لەسەر ئەو بڕوایەم و پێم باشترە بەسینی نانخواردنەوە، لەژێر دارێك دا نیشم نەك لەژێر پۆمپی گاز. وەلێ داستانە خەندە هاوەرو وێنەدارەکان بابەتی سەرنج راکێشن.

لە لە هونەری بازرگانی کراودا شت گەلێکی شیاوی کەڵك وەرگرتن و ژیانبەخش هەن – ئێمە کەڵکیان لێ وەردەگرین بەلاّم لەراستیدا لایەنگری گەمژەیی، مرۆڤ کوژی ناونەتەوەیی و بەرەڵایی هەرزەکاران نین.

لەسەر ئەو بڕوایەم کە کارەکەم لەگەڵ چیرۆکی وێنەدار جیاوازی هەیە، بەلاّم ناوی گۆڕانکاریشی لێنانێم. ئەو کارەی کەمن دەیکەم بیچمە، لە کاتێکدا چیرۆکی وێنەدار خاوەنی بیچم – بە چەمکێك کە لەزەینی من دایە – نییە. کتێب و گۆڤارە چیرۆکییەکانی وێنەدار خاوەنی بیچمن، بەلاّم هەوڵی جیددی بۆ یەکبوونیان نەدراوە تا پەیامێکی سەربەخۆ بگەیەنن. واتە شێوەی جۆراوجۆری بازرگانیان هەیە. ئامانج جیاوازیە: خەڵك دەیانهەوێ بیکیشنەوە، من دەمهەوێ یەکیەتی پێ ببەخشم. کاری من بەکردار لەگەڵ چیرۆکە وێنەدارەکان جیاوازی هەیە، بەومانایە کە هەر کارێکی من نیشان و هێمایەکە و جێگای تایبەتی خۆی هەیە. رەنگە لەڕوانگەی هێندی کەسەوە جیاوازییەکە کەم بێت.

---

[5] Cezanne

جیاوازی زۆرکات زۆر نییە، بەلاّم هەر ئەورادە کەمەش گەلێك گرینگە.

س: مۆزەخانەدارێك لە مۆزەخانەی مۆدێرن، هونەری پۆپی بەفاشیست و میلیتاری نێوبردووە.

ل: قارەمانی داستانە وێنەدارەکان لە جۆری فاشیستین، بەلاّم من لەناو تابلۆدا بایەخیان نادەم. لە وانەیە لەو گرینگی نەدانە خالّێکی سیاسی شاراوە هەبێت. من تەنیا لەبەر هۆکارەی ڕوخساری کەلّك لەوانە وەردەگرم، لە کاتێکدا ئەو قارەمانانە بۆ ئەوەی مەبەستە نەخولّقاوەن. ئەو تەکنیکەکانەی کەمن کەلّکیان لێ وەردەگرم بازرگانی نین، تەنیا لە ڕوالّەتدا وادەنوێنن. شێوەی ڕوانین، دارِشتن و یەکیەتی بەخشینی من جیاوازن و ئامانجی جیاوازیشان هەیە.



## هێنری مۆ[1]

## ١٨٩٨ — ١٩٨٦

## Henry Moore

**لە بابەتێك بەناوی «پەیکەرتاش دەدوێ»**

پەیکەرتاشی مۆر لەدەیەی ١٩٣٠ سەرەتایەك بوو بۆ دەرکەوتنی پێوەندی و مەودا لەنێوان فەزای پڕو فەزای بەتالّ. بەلاّم بەهەرحالّ هۆگری و مەیلی زۆری مۆر بۆ پەیکەرە و بیچمە سروشتییەکانی هەروەك خۆی مایەوە، هەر وەکو لەم نووسراوەی سالّی ١٩٣٧دا بلاّوکراوەتەوە، بەروونی دیارە.

هەلّەیە پەیکەرتاش یان وێنەگەر سەبارەت بەکارەکەی زۆر بدوێ یان شتێك بنوسێ. ئەوکارە لە جیددی بوونی کەم دەکاتەوە.

کاتێك پەیکەرتاش یان وێنەگەرێك هەولّ دەدا ئامانجەکانی خۆی بەوردی و بە لۆژیکی دەربڕێ، زۆر زوو دەتوانی ببێتە بەتیۆریسیەنیك و کارەکەی ببێتە نواندنێکی داخراو و سنووورداری ئەو چەمکانەی بەرە بەرە بەشێوەی لۆژێك وشە لەزەینی دا بیچم دەگرن.

١- پەیکەرتاشی بەریتانی.

گەرچی پەیکەرتاش یان وێنەگەر هۆشیان وریایە و روون نییە، وەلێ بەشی نالۆژیکی و غەریزەی و نەستگای زەنیشیان دەبێ دەورێکی کاریگەریان لە کارەکەیدا هەبێ. لە چاخی گوتی کە پەیکەرتاشی ئوروپا پڕ ببوو لە گژو گیای بژار، یانی لەرووبەردا هەموو جۆرە زیادیەك کە بەتەواوی بیچمیان دەشادەوە. ئەو پەیامی تایبەتی((بزانکۆزی[2])) بووکە پەیکەرتاشی لەو زیادیانە رزگار بکا و جارێکی تر سەرنجمان بۆ بیچم رابکێشێ و وریامان بکاتەوە. بۆ ئەوکارەش ((بزانکۆزی)) دەبوایە جەخت زۆر لەسەر بیچمی سادە و راست بکات یانی پەیکەرتاشی خۆی بەواتای تاك ئوستوانەیی دەهێشتەوە و ئەو بیچمە تاکەی لەرادەبەدەر دەپالاوت ودایدەتاشی. کاری برانکۆزی جگە لە نرخی تاکە کەسی بۆ خۆی، لە ڕووی مێژوویش لە پێشکەوتنی پەیکەرتاشی هاوچەرخ دا گرینگی هەیە. بەلاّم ئێستا لەوانەیە پێویست نەبێ پەیکەرتاشی بە بیچمی تاکی (چەقبەستوو) سنووردار بکەین.

دەتوانین ئەو سنوورانە وردەوردە لە ناوببەین و بەربلاّو تر بیربکەینەوە. یانی چەند بیچمی جۆراوجۆر، بەبەش، لایەنی جیاوازەوە لێکبدەین و تێکەلاّویان بکەین و بەیەك گشتیان بگەیینین.

گەرچی ئەندامی مرۆڤ پتر لە هەر شتێك سەرنجمان رادەکێشێ، بەلاّم من هەردەم سەرنجمداوە کە بیچمە سروشتیەکانی وەکو ئێسقان، سەدەف، زیخ و شتیتر سەرنجیان راکێشاوم. واپێش هاتووە من چەند ساڵ بەدوای یەکدا لەقەراخ دەریا بەسەرم بردبێ. بەلاّم هەر ساڵە شێوەیەکی نوێی زیخ سەرنجی راکێشاوم کە ساڵی

[2] Constantin Brancusi : بەلێکۆلێن و توێژینەوە لەسەر پەیکەرە سەرەتایەکانی ئەفریقایی، بەدەربڕینێکی سادە و کورت کراو بە بەرهەمەکانی گەیشت. ئەو لەبەر چاوترین هونەرمەندانی مۆدێرنە.



پێشتر سەرەڕای ئەوەی زۆرو زەوەندیشی نەمدیتوون. ئەگەر دابنیشم و لویچێك لەو وردە بەردانە هەڵگرم و یەك بە یەك لێیان بڕوانم ئەو جار شتێکی تر روودەدا. دواتر لەوانەیە ئەزموونی خۆم سەبارەت بەبیچمم بە دەرفەتتدان بەهۆش — بۆ خووگرتن بەبیچمی نوێ — پەرە پێبدەم.

هێندێك بیچمی گشتی هەن کە ئێمە لە نەستگادا خوومان پێیان گرتووە، کە ئەگەر کۆنترۆڵی هەست، ئەو بیچمانەبە شاراوەیی نەهێڵتەوە، لەوانەیە بەرامبەریاندا کاردانەوەمان هەبێت. زیخ رەوشی سرۆشتی کارکردن بە بەردومان نیشاندەدا.

# ئیڤا هێسە[1]

## ١٩٣٦ — ١٩٧٠

## Eva Hessa

**لە هەڤپەیڤینێك**

کورتەی ئەو هەڤپەیڤینە لەگەڵ سیدی نێمسێر، لە ساڵی ١٩٧٠دا، کەمێك بەر لە مردنی ئیڤاهێسە بڵاوکراوەتەوە. هێسە لە دەیەی ١٩٦٠دا لەبەرامبەر شێوەگەرایی گشتی هونەردا ڕاوەستا.

سیندی نێمسێر[2] (ن): سەبارەت بەپێشینەی بنەماڵەتان بدوێن. ئیڤا هێسە(هـ): ...دکتۆر گووتی ژیانی من بەلایەوە زۆر سەیربووە... بوونی تۆمۆرێکی مێشك ( ) لە تەمەنی ٣٣ ساڵیدا گاڵتە نییە. ئەرێ، هەموو ژیانی من بەم شێوەیە بووە. من لە هامبورگ لەدایك بووم . باوکم قازی بەشی تاوان بوو و تازە خوێندنی دەورەی دکتۆرای خۆی تەواو کردبوو. دایکیشم جوانترین دایکی جیهان بوو.

شێوەی لەینگریەد بێرگمەن[3] دەچوو. بەڵام نەخۆشی عەسەبی و دەروونی هاوکات ئازاریان دەدا. دایکم لە هامبورك لەبەشی هونەر دەیخوێند. خوشکم لە ساڵی

١- پەیکەرتاشی ئەمریکی (لەدایك بووی ئەڵمانیا)

[2] Cindy Nemser

٣- ژنی دەورگێڕی سویدی.Ingrid Bergman



١٩٣٣دا لەدایك بوو و منیش لە ساڵی ١٩٣٦ دا. لەساڵی ١٩٣٨ کە ئازاردانی بەربلاوی منالاَن دەستیپێکرد، من و خوشکمیان سواری شەمەندفەرێك کرد. و چووینە هۆڵەند. بڕیار بوو مامم و خێزانی لە ئاستردام ئێمە لای خۆیان بهێڵنەوە، بەڵام ئەوکارە مسۆگەر نەبوو. هەر بۆیە ئێمە یان بە ماڵی منالە کاتولیکەکان سپارد کە هەمیشە لەوێ نەخۆش بووم. دواتر منیان بردە نەخۆشخانە و بەوجۆرە لەخوشکم دابڕام. دایك و باوکم لە شوێنێك لە ئەلمان خۆیان حەشاردا و دواتر هاتن بۆ ئەمستردام و بە زەحمەتێکی زۆر ئێمەیان لە هۆڵەندا وە بردە بەریتانیا. مامم و هاوسەرەکەی سەرەنجام خەبەریان لە ئۆردوگاکانی کاری ئیجبارییەوە هات.

هیچ ئەندامێکی تری بنەماڵەمان نەیتوانی خۆی رزگارکات ... من تەنیا خوشکێکی ساغم هەیە. لەژیانمدا هیچ شتێك ئاسایی نەبووە. تەنانەت هونەرەکەشم. (ن)... بەبڕوای من لە کارەکانی ئێوەدا هەستە بزوێنەرەکانی سێکسی یان هەستی زاتی زۆر بەرچاون، واهەست دەکەم پتر سەرنجی شێوە مرۆڤ بوون.

(هـ) ئەوە بۆ من بابەتێکی ساکار نییە. یەکەم، کە کاردەکەم لەراستیدا بەشێوە و حاڵەتی ئەبستراکت کاردەکەم، یانی بە مادده، بیچم، ئەندازە، پێوان و هەل و مەرجی شۆێن، بەڵام لەهەر حاڵێشدا، من کۆی وێنکە لەسەر بنەمای ئەو لایەنە ئەبستراکتی و جوانی ناسانە هەڵناسەنگێنم. بۆ من ئەوە تێکڕای وێنەکەیە کە پێوەندی بەمن و ژیانەوە هەیە و ناتوانین وەك ئەندێشەیەك، دارشتن یان بیچمێك وەلای بنێین. بەبڕوای من ناتوانین هونەر لەسەر ئەو بنەمایە دابمەزرێنین.

نامەوێ ئاستەنگی لەوشتانە بۆ خۆم دروست بکەم ... ئەو کەندو کۆسپانە دەتوانن چارەسەربکرێن" من بەباشی، دەتوانم چارەسەریان بکەم. لەراستیدا نیازم وایە هەموو ئەو شتانەی تائێستا سەبارەت بەو کێشانە فێری بووم یان فێریان کردووم لە

زەینمدا بیانهاوێژەمە دەرەوەو شتێکی نوێ بۆ خۆم بدۆزمەوە. لەم رووەوە ئەوە بەناچاری دەبێتە ژیان و هەست و بیری من. لێرەدا کەسایەتییەکی زۆر ئاڵۆزم. من کەسایەتییەکی سادەنیم و ئەو ئاڵۆزیەش... هەمووی پووچەڵی ژیانە. وابیردەکەمەوە پێوەندی من — هەڵبەت ئەگەر پێوەندییەکی هەبێت — لەگەڵ ئەو هونەرمەندانەی هەست دەکەم زۆر لێیان نزیکم زۆریان دەکەم، هەلێرەوە سەرچاوە بگرێ. پێوەندی من لەگەڵ ئەو هونەرمەندانە لەرێگای نووسین و خوێندنەوەی کارەکانیان نییە، بەڵکو زیاتر بەهۆی ئەو ((هەستی پووچەڵ)) یە کە لە کارەکانیاندا دەیبینم.

(ن): ئەو هونەرمەندانەکێن؟

(هـ): دۆشان، ئێون. رەینەر،[1] یونیسکۆ[2]، کارڵ ئاندری[3]

(ن): ئێستا هەندێك سەبارەت بەو پەیکەرانەی کە لەسەرەتای کارەکەتان دروستتان کردوون، بدوێین.

(هـ): یەکیان پەیکەرەێك بووکە بۆ پێشانگای گەلەری گراهام[4]... لە ساڵی ١٩٦٥ یا ١٩٦٦ دا دروستمکرد، ناوی ((دژواری یا ئازادی)) بوو. ناوێکی گاڵتەجاڕ... بەلاّم ناتوانم بیگۆڕم. وابزانم پێنجەمین پەیکەر بوو دروستمکرد. لام وایە گرینگترین دەربڕینی من بوو. یانی نزیك بە وشتە بوو کە واهەست دەکەم ئێستا لە باشترین پەیکەرەکانمدا پێی گەیشتووم. بە بۆنەی ئەو پەیکەرەوە بوو بۆ جاری یەکەم پووچەڵی بوون یا ئەو هەستە قوڵەی کە لە زەینمدا بوو ئاشکرا بوو.

(1) Yvonne Rainer
(2) Ionesco
(3) Carl Andre
(4) Graham



## فرانك لویدرایت (1)

## ١٨٦٧ — ١٩٥٩

## Frank Lioyd Wright

**لە: ((فەلسەفەی هونەری جوان))**

رایت ئەو بیروڕایانەی لە کۆبونەوەی ((کۆمەڵەی تەلارسازی ئەنیستۆی هونەری شیکاگۆ)) لە ساڵی ١٩٠٠دا دەربڕی.

ئێمە لە سروشتدا هەمیشە هاوئاهەنگییەك لە نێوان بیچم و کارکرد لەگەڵ بنەماکانی ژیان دەبینین و هەست پێدەکەین. ئێمە ئێمە چەند درەختی کاج و بەڕوومان ئازادانە خۆش بوێ، ئەو ئازادییە هی ئێمە نییە- وەلێ دوور نییە زاتی ئێمە ئەو ئارەزووەی هەبێ.

شارستانییەت بۆ ئێمە یانی((رێك و پێك کردن))ی بارودۆخی سەرەتایی سروشتمان. خۆزگە دەمتوانی لە وشەیەکی تر جگە لە ((رێکوپێك کردن)) کەڵك وەرگرم چونکە هونەر پارێزەرێکی گەورەی هەستە ناسکەکانی مرۆڤە. بەوشێوەیە میسرییەکان گیای لۆتۆسیان[2] Lotus دەناسی و ئەوەیان لەدروستکراوە بەردین و بە شکۆیەکانی تەلارسازی خۆیاندا نیشان دەدا. ئەوەیانی لۆتۆسی(( رێکوپێك کراو)). یۆنانییەکان

١- تەلارسازی ئەمریکی.

٢- هەمیێ کێویلە (وەرگێڕ)

گیای (( ئەکنێنپون[3])) Acuntnus یان دەناسی و بەمەبەست لەبەرد دایاندەتاشی. ئەوە یانی ئەکنێنپونی (( رێکوپێك کراو)). لە ناو هەموو هونەرەکاندا، لە وانەیە تەنیا تەلارسازی کە ئەو دەرسەمان بە باشترین شێوە تێبگەێنیی. چونکە لە تەلارسازی پراکتیکیدا ئەو بابەتە (( رێکوپێك کردن))ی سروشتی، بەباشترین و بەرزترین شێوە ئەنجام دەدرێ. بەرهەمێکی تەلارسازی بەهیچ روویەکەوە سروشت گەرا نییە، بەڵکو بەرزترین و زەینی ترین رێگا (( رێکوپێك کراون))ی سروشتە. لەهەمان کاتدا، دەبێ لەبنەمادا وەفاداری سروشت بێ.

٣- کەنگر (وەرگێڕ).



## والتێرگرۆپیوس

**١٩٦٩ — ١٨٨٣**

**Walter Gropius**

**لە: ((لەداوێنی تەلارسازی مکوڕ))**

گرۆبیوس وەك لەبیرو راکانی کە لە ساڵی ١٩٤٣ دا بلاۆکراونەتەوە، نیشان دەدا کە هۆگری لایەنەکانی کۆمەلاۆیەتی و جوانی ناسانەی بینا و شارسازییە.

هەر مرۆڤێکی بیرمەندی چاخی ئێمە، بەدوای وەلاۆمی ئەو پرسیارەدا دەگەڕی کە نرخی دوایی ئەو پێشکەوتنە سەرسوڕهێنەرانە چییە؟ ئێمە بەدەنگێکی بەرز پیشەسازی نوێ و ئەو داهێنانە تازانەی کە پێوەندیان بە خێراتربوونی کەرەستەکانی راگواستان و بارهەڵگری هەیە، رادەگەێینین. بەلاۆم چی لە پاشەکەوتی کات دەکەین؟ ئایا بۆ بیرکردنەوە سەبارەت بە بوونمان کەڵکی لێ وەردەگرین؟ بیری لێناکەینەوە، بەڵکو کار و چالاکییەکانی خۆمان پتر دەکەین و خۆشمان دەدەینە دەست دروشمی درۆیینی((کات زێڕە)). بێگومان پێویستە زۆر بەوردی بۆ خۆمانی روونکەینەوە کە ئامانجی مەعنەوەی و بیرمەندانەی ئێمە چییە؟

لەبەر ئەم هۆیانەیە حەز دەکەم هەوڵبدەم ئامانجی بنەڕەتی، سەرەکی و هێزی دەروونی بەرنامەرێژی کارەکەم یانی تەلارسازی لە چوارچێوەی فەرهەنگ و

سیاسەتی شارستانیەتی پیشەسازی دا، بەکورتی شی بکەمەوە... ئاشکرایە کە لە چاخی زانستی ئێستادا ، بەهۆی بەر بلاوی بەشەکان، لە تێگەیشتنی ژیانی ئالۆزی خۆمان وەکو کۆیەکی تاك بەجێماوین... لە جیهانی هاوچەرخدا، کەسێکی شارەزا بە بارودۆخێکی مام ناوەندی کە کەندوکۆسپەکانی بەربلاوی ژیانی رۆژانە ئالۆز و پەرێشانیان کردووە، هەولْ دەدا خۆی لە تەوژمی ئەرکەگشتییەکان رزگار بکات. بۆ ئەو مەبەستەش بەرپرسێتی بەرتەسك و سنووردار لە بابەتێکی پسپۆری هەلْدەبژێرێ و لە وەلامدانەوە هەر بابەتێکی تر خۆی دەپارێزێ. هەموو شتێك پرش و بلاو بووە و بە شێوەیەکی سروشتی بچووکی و پارچە پارچە بوونی ژیانی لێ کەوتۆتەوە. هەر ئەو جۆرەی ئەلبێرت ئەنشتەین دیگوت: وا دیارە دابین کردنی کەرەستەکانی ژیان و سەر لێشێواوی ئامانجەکان تایبەتمەندی چاخی ئێمەیە...))

بەلام بارودۆخی ئێستا ئەوە دەگەیەنن کە ئێمە بەرەبەرە لە تەخەسوس گەرایی و کاریگەری وێرانکەر و مەترسیدارەکەی لەسەر کۆمەلْگادا دوور دەکەوینەوە... بۆ یەکیەتییەکی سەرلەنوێ کە کارێکی مەزنە، تەلارساز و شارساز دەورێکی گرینگیان هەیە. تەلارساز دەبێ وا پەروەردەبێ کە سەرەڕای هەبوونی ئەو زانستە تەخەسوسی و بەرتەسکانەی  کە دەبێ فێری ببێ و ئاوێتەی کارەکەی بکات. هەرگیز نابێ روانینی قولْ و بەربلاوی خۆی  لە دەستبدا. تەلارساز دەبێ لە زەوی، سروشت، مرۆڤ و هونەرەکەی وەکوکویەکی تاك تێبگات. ئێمە دەبێ بە هەموو بوونمانەوە لەسەر ئەو بابەتە پێداگربین کە لە کۆمەلْگای ماشێنی ئەوڕۆدا، هێشتا جیهانێك لە مرۆڤەکانین. مرۆڤ لە هەرێمی سروشتی خۆیدا، دەبێ ناوەندی هەموو بەرنامەکانی شارسازی بێ. ئێمە وەها بووینەتە کۆیلەی دواهەمین دەسکردی خۆمان، یانی مەکینە، کە دەرکی راستەقینەی نرخی خۆمان لەدەست داوە. کەواتە پێویستە لە جیاتی ئەوەی خۆمان بدەینە دەست گوشاری ئارەزووەکانمان یان روانگەی تاقمێك کە ماشێنی بە ئامانج دەزانن، لێکۆلێنەوە لەسەر ئەو بابەتە



بکەین کەچ شتێك پێوەندی شیاو و راستەقینەی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ، سروشت و مرۆڤ پتەوتر دەکا. تەنیا رێگەی پێشکەوتن، بریتییە لە دەسپێکردنی ئەزموونە نوێیەکانی کرداری، دلێرانەو دوور لە رەگەزپەرستی، بەدروستکردنی کۆمەلْگاکان بەزووترین کات و دواتر لێکدانەوەی وردی بە هاکانیان لە روانگەی ژیانەوە. وابیننە بەرچاوتان: ئەگەر هێندێك گرووپ پێکهاتوو لە تواناترین شارسازان و مێعماران ئەرکداربن کە مۆدێلێکی نوێی گشتی گەلالە و دروست بکەن، چ گەنجینەیەکی گەورە لە زانیاری نوێ بۆ کۆمەلْناسان، ئابووری ناسان، بلیمەتەکان و هونەرمەندان دەست دەکەوێ ! جگە لەوەش، گەنجینەیەکی وەها سەرچاوەیەکی زانیاری زۆر بەنرخ بۆ چارەسەرکردنی کێشەی ئالۆزی نۆژن کردنەوەی کۆمەلْگای ئێستاش دەبێ.

# ئێدوارد وێستۆن (1)

## ١٨٨٦ — ١٩٥٨

## Edward Weston

**لە: ((هونەری وێنەگری))**

وێستۆن پێداگری بووکە وێنەگر دەبێ وێنەی کۆتایی پێش شتنەوەی فلیم لە زەینی خۆیدا وێنا بکات، نە ئەوەی وێنەی چاپکراو ڕتوش بکات. نووسراوەی ژێر لە (( دایرە التعارف)) یێك (چاپی ساڵی ١٩٤٢) دا وەرگیراوە و هەولێکە بۆ کۆی گشتی هێندێك لە بیروڕاکانی سەبارەت بە وێنەگری کە لە دەفتەری بیرەوەرییەکانی ڕۆژانەی دەینووسی.

لێنزی کامێرا وەها روون دەبیننێ کە ناتوانین بۆ گرتنی لایەنە روالەتییەکانی بابەتێك بەکاری بێنین... بەڵام ئەگەر راستگۆیی خودی کامێرا، بەسنوردارکردنی بابەتێك لایەنی بۆ بوێنەگر دژواری پێك بێنێ، زیانی ئەوکارە کەمترە لە قازانجی" چونکە هەر ئەو راستگۆییەیە

لە کامێرا، بۆ راوینینێکی قوڵ لە مانای شتەکان، ئامرازێکی لەبارچێ دەکا. وێنەگری وریاو وردبین... بەم تێڕوانینە رۆحی ئەو شتە دەردەخا کە لە بەرامبەر لێنزدایە کە بینەر وێنەی خولقێنراو راست تر لە خودی بەرهەمەکە دەبینێ و باشتری تێدەگا. وێنە ساتێك لە زەمان جودا دەکاتەوە و بۆ هەمیشە رایدەگری: ساتێکی گرینگ و پڕمانایا بێ نرخ و بێ ماناو. ئەوەش گرێدراوی تێگەیشتنی وێنەگرە لە بابەتەکە و رادەی زاڵ بوونی بەسەر کارەکەیدایە. لینز بە مەیلی خۆی هیچ شتێ نیشان نادا. بەپێچەوانەوە روانینەکەی تەواو بێ لایەن بێ ئاگاو دوور لە رەگەزپەرستییە. لینز جیاوازییەك لە

١- وێنەگری ئەمریکی.



نێوان بەشەگرینگ و ناگرینگەکان دانانی. هەڵبژاردن، جەخت کردن و مانا دەبێ بەهۆی وێنەگر و لەو پێکهاتەدا دابێ کە دەیخولێنێ.

دارشتنی باشی بابەتێك، بەمانای باشترین رێگای مسۆگەر بۆ دیتن و نواندنە. توانایی وێنەگری لە نیشان دانی حاڵەت و وردکارییە ناسکەکانی، لێنز دەکا بەئامێرێکی بێ وێنە بۆ گرتنی بیچم و حاڵەتەکان. وردبینی و سەرنج دانی توانای تۆمارکردنی رەنگ یان سێبەر لە ئاستێکی بەرزدا بەئێمە دەبەخشێ... وێنەگر نابێ پشت بەو یاسایانە ببەستێ کە پێشتر لە شوێنی تردا ئەنجام دراون. وێنەگر دەبێ فێربێ شتەکان بە چاوی خۆی و کامێرا ببێنێ، تەنیا لەو رێگەیەیە دەتوانێ بابەتی خۆی نیشان بدا. بەجۆرێك کە بتوانێ هەستی خۆی سەبارەت بەکامێرا، بۆ ئەوانی تر بگوێزێتەوە. زانستی دەروونی دارشتن بە بەکارهێنانی توانایەکانی هونەری وێنەگری، وێنەگر والێدەکا لەکاتی دەرکردنی بابەتەکە، وێنەی لێ هەڵبگری دیمەنی سروشتی ژێر رووناکی، بیچمی هەور، تەکانی دەست، یاحاڵەتی زووتێپەڕی روخسارێك، کە قولاّیی ژیان بنوێنێ ئەم ساتە زوو تێپەڕانە لەدەست نەدا واتە ساتگەرابێ.

ئەو هێزەی لە تۆمارکردنی رووداوێکی وەهادا ئێمە بۆ لای خۆی رادەکێشێ، زیاتر بە هۆی بوونی ئەو حەقیقەتەیە کە لە وێنەکەدا شاردراوەتەوە. کاتێك بینەر بایەخی لێی دەڕوانێ لەراستیدا وا بیردەکاتەوە کە ئەگەر بۆ خۆی لەو شوێنە بوایە، ئەو دیمەنە یا ئەو شتانەی دروست بەو شێوەیە دەدیت کە وێنە کە نیشانی داوە ئەوسا پێدەدات. ئێمە دەزانین کە چاوی مرۆڤ توانای کارێکی وەها گەورەی نییە و جگە لەوەش وێنەگر دیمەنەکەی بەوردی چێ نەکردووە. تەنانەت لەوانەیە نەتوانین بەدیتنی وێنەکەی خۆمان، دیمەنەکەش بناسینەوە.

سەرەڕای ئەوەش، قەبوڵ کردنی واقعی وێنەکەیە کاردانەوە لە بینەردا وەدیدێنێ و دەبێتە هۆی ئەوەی راستەوخۆ لە ئەزموونی هونەرمەندا بەشداری بکات.

# ژێری ئۆئێلسمان
## لەدایك بووی ١٩٣٤

لە وتەکانی کۆبوونەوەیەك: ((هێندێك  لایەنی مرۆڤ دوستانەی وێنەگری))

بیروڕای ئۆئێلسمان سەبارەت بە وێنەگری — وێناکردنی زیهنی وێنە دوای شتنەوە-پێچەوانەی تیۆری ئێدوار درێستۆنە کە بریتییە لە وێناکردنی زیهنی وێنە، پێش شتنەوە. نووسراوەی ژێر کورتەی وتاری ئوێلسمانە لە کۆبوونەوەی (ئەنجومەنی سەڵتەنەتی وێنەگری بەریتانیا).

هەر بەو جۆرەی کە دەزانن، لایەنی جوانی ناسانەی زاڵ لە وێنەگری دا بە((پێشی وێناکردن[1]))

ناونراوە. ئەوە بەومانایەیە لە ساتێکدا کە کونەرۆژنەی کامێرا دەکرێتەوە و وێنە دەگرێت، وێنەی تۆمارکراو تەواو و پێشتر پێش بینی بۆ کراوە. ئێستا رای من ئەوەیە کە وێنەگران دەبێ ئامادەیی ((دۆزینەوەی کاتی کارکردن)) یان هەبێت.

بەبڕوای من لە هەموو بوارەکانی تری هونەری دا ئەو ((دۆزینەوەی کاتی کارکردن)) هەیە.

وێنەگەر کاتێك دەست بە کێشانەوەی تابلۆیەك دەکا، وێنەیەکی تەواو دیاریکراوی لە زەیەندا نییە. هەروەك چۆن پەیکەرتاش لەسەرەتای کاری خۆی پەیکەری تەواو دیاریکراوی لە زەین دا نییە. لە هەر دووحاڵەتدا. گوتارێکی دوولایەنە دەستپێدەکا

[1] Previsnalization



وبەرەوپێش دەچێ. بەبڕوای من ژووری شتنەوە دەتوانێ کارگەیەکی لێکۆڵینەوەی تایبەت بۆ دیتن و جێگایەك بۆ داهێنان، روانین و تێفکرین بێ.

تەنانەت من خۆشم لە هێندێکی وێنەکانم تێناگەم . ئەو مەبەستە هێندێك کەس نارەحەت دەکا. من لەسەر ئەو بڕوایەم کە ئەمڕۆ تا ئەو رادە پێشکەوتوین تێبگەین هێندێك سیستەمی زانستی هەن زمانیان گرێدراوی وشەکان نییە. هێندێك ئاستی زانیاری دەروونی هەن مرۆڤ دەتوانێ لە جیهانی وێنەگری پێیان بگات. بەڵام لێدوانیان کارێکی ئاسان نییە... من وابیردەکەمەوە کە زۆرجار ئێمە ناچارین هێندێك شت بە وشە دەربڕین کە بەتەواوی لێیان تێناگەین، بەڵام لە هەرحاڵدا وەشەکان گرینگیان هەیە...

بەو دوایانە وێنەیەك بەتوندی نارەحەتی کردم. لە رۆاڵەتدا نازانم چی روویداوە: شەپۆلێك دەبینرێ، بیچمێکی رێك و پێك لە بەستێندا بووە و دوای تۆفان شتراوەتەوە وون بووە...بەڵام رووداوێکی سەیر رووی داوە. حاڵەتێکی سەیر کە بەهیچ جۆر من ناتوانم دەری ببڕم. وابیردەکەمەوە کە ئەگەر ئێمە وێنەگران هەرچی زوو تر لەو دیاردەیە ئاگادار بینەوە کە لە رێگای دیتن — ەوە هێندێك جار دەتوانین لەگەڵ یەکتر بدۆێین، هەمووومان شادتر و رازی تر دەبین، چونکە گەلێك جار من ناچار بووم وەڵامی زمانێ شتێك بدەمەوە کە ناتوانم بە زمان بیپارێزم.

# مایکێل گریڤێز[1]

## لەدایك بووی ١٩٣٤

## Michacl Gravez

**لە: ((ناوەندی تەلارسازی بان مۆدێرن))**

ئەو هەڤپیڤینە لەگەڵ مایکێل مەك تویگان[2] لەساڵی ١٩٨١ کە گریڤێز خەریکی گەڵاڵەی ((بینای خزمەتگوزاری گشتی)) بوو، بلاٌوکرایەوە. ئەو بینایە دوای ماوەیەك بە(( بینای بان مۆدێرنی ساڵ)) ناونرا.

مایکێل مەك تویگای (م): سەیرە لەوشەی (( پەیکەر)) کەڵك وەردەگری، ئایا مەبەستتان ڕەهەندەکانی لەشی مرۆڤە؟

مایکێل گریڤێز (گ): ئەو شتانە و زۆرشتی تریش وەك دەرگا، پەنجەرە، فەزا پێوەندیان بە بیچمی مرۆڤە وە هەیە. بۆ وێنە ئەگەر من لە گەڵاڵەیەکی یەکتر بڕ کەڵك وەرگرم، هیچ گرمانی تێدا نییە کە فەزای ئەساسی بۆ ئێمە لەناو ژوورەکەدا کوێیە.

ئێستا ئەگەر لە تەلارسازی((De Stijl[3])) بڕوانین، ناساندنی لەشی مرۆڤی بەروونی تێیدا نابینرێ. من ناتوانم خۆمی تێدا بدۆزمەوە.

١- تەلارسازی پۆست مۆدێرنی ئەمریکی.

(2) Michael Mctwigan

(3) بزووتنەوەیەکی هونەری کە بەرەو نێئو پلاستی سیزم مەیلی هەبوو دواتریش بەرەو دادائیزم.



(م): لە وانەیە بەو هۆیە بێت کە زۆربەی خەڵك لەگەڵ مێعماری نوێ هەست بەنامۆیی دەکەن... تەلارسازی نوێ دابڕاوە و بەراستی پێوەندی بە مرۆڤەوە نەماوە... ماوەیەك لەمەوبە ((رۆبێرت ئیستێرن[4])) ی تەلارساز دەیگووت: ((کاری ئێمە پەروەردەکردن و گۆڕانکاری سروشتی ئینسان نییە، کاری ئێمە وەلاٌم دانەوەی بارودۆخی مرۆڤە، ئێمە چاکساز یا شۆڕشگێڕنین)).

ئەو وتەیە زۆر بەنرخە، تەواو دژی ئەو شتەیە کە لەسەردەمی ((باهاوس[5])) دادەگوترا.

(گ): ... لە بوارێکەوە ئەو شتەی رۆبێرت دەیڵێ ئەوەیە کە ئەورۆ کاتی بلاٌوکردنەوەی مانیفیستۆ نییە. وەبیرم دێ لەسەرەتاکانی دەیەی ١٩٦٠دا من و پیتەر ئەیسمەن [6]بەیەکەوە کارەمان دەکرد، دەماننەویست بەیاننامەیەك بنووسین، دەمانهەویست ئەندازیاری نوێ بین و بڵێین (( دەبێ ئەمها بێ نەك ئاوها...))

ئێمە دەمانهەویست ئەندێشەکانمان بە چەمکێکی گشتی بۆ خۆمان روونکەینەوە نە ئەوەی جەخت لەسەر تایبەتمەندییەکانی تاك، شوێن و شتی تر بکەین. مەبەستم ئەوە نییە کە ئەورۆ بیروڕامان گۆڕاوە، بەلاٌم بیاننامەی ئەمڕۆ زۆر هێدی ترە. لە هەرحاڵدا من ناڵێم ئێمە چاکساز نین، بەڵکوو بەپێچەوانە، ئێمە بەتەواوی مانای وشەو چاکسارین. ئێمە هەوڵ دەدەین بەو جۆرەی پەیوەندییان بە ئێمەوە هەیە گرفتەکان بنیاد بنێین. نە ماشێن... ئێمە چاکسازین بەو مانایە کە نامانهەوێ

(4) Robert Stern

(5) Bauhaus: ڕێبازێکی کاریگەری تەلارسازی و هونەرەکارکردییەکانی ئەڵمانییە کە لە وایمار لە ساڵی ١٩١٩ دا لە لایەن والترگرپیپوس بنیاتنرا هەوڵی ئەوان لە ئاراستەی پێوەندی دانی بنەماکانی جوانی ناسی لەگەڵ بەرهەمەکانی پیشەسازی مۆدێرنبوو.

(6) Petet Eiseman

بەرەو شتێك بگەڕێنەوە، بەڵکوو دەمانهەوێ زمانی بیناسازی لەنوێوە بنیات بنێین. لێرەوەیە کە بیاننامە دێتەگۆڕێ.

گەرچی لە ئەدەبیات دادەتوانین بە خوازە لە پەنجەرە کەڵك وەرگرین، بەڵام تەلارسازی خودی پەنجەرەی لە ئیختیاردایە. ئەو تەلار سازانی ئەورۆیین کە دیانهەوێ پەنجەرە وەلابنێن. هێندێك کەسی وەك من هەن کە زۆر سادە دەڵێن ((پەنجەرە هەیە و من کەڵکی لێ وەردەگرم.)) پەنجەرە پێوەندی لەگەڵ لەشی مرۆڤ هەیە و بەهۆکاری جوانی ناسانە، زانستی و فەرهەنگی پێوەندی لەگەڵ دیواریش هەیە بێ هۆ نییە لانی کەم ٢٠٠٠ ساڵە پەنجەرە هەیە. مەبەستی گرنیگیش ئەوەیە.

کەواتە. من دەبێ دەسکارییەکی چاوەڕوان نەکراو لە وتەکەی رۆبێرت بکەم و بڵێم و دەمەوێ زمانی تەلارسازی لە نوێ بنیاد بنێم.

(م): کەواتە بابەت تەنیا پەروەردەکردنەوەی نوێ نییە، فێرکردنی زانیارییە کۆنەکانیش لە ئارادایە. دەتوانین بڵێین کە دەیەی ١٩٦٠دا خەڵك وێنەگەریان فەرامۆش کردبوو، ئەو وتەیە سەبارەت بە تەلارسازیش راستە.

(گ): هەر بەو جۆرەیە، تەلارسازێك بە ناوی (( لێئو کرایەر[1])) کە لە لەندەنە دەلێ چیدی بینا دروست ناکات، چونکە نەریتێك بۆ ئەو پیشەیە نییە، ئەو بتوانی بیناکانی لەسەر ئەو بنەمایە دابنێ. بابەتی سیاسی وی ئەوەیە کە دەبێ شۆڕشی پیشەسازی لە ناوببەین. کەواتە ((لێئو)) وێنەگەری دەکا و دەڵێ ((وەرن بۆ نەریتی پیشە بگەڕێنەوە)).

(1) Leo Krier



## سندی شێرمەن[1]

## لەدایك بووی ١٩٥٤

## Cindy Sherman

**لە هەڤپەیڤینێك**

نووسراوەی خوارەوە کە لە هەڤپەیڤینێك لەگەڵ (( جەین سیگیل[2] )) لە ساڵی ١٩٨٨ دا وەرگیراوە، شێرمەن دەوری خۆی لە وێنەگری دا دێنێتە سەرزمان.

سیندی شێرمەن (ش) : من تا ئێستاش دەمهەوێ جۆرێك لە وێنەگری فیلم ئاسا بەدی بینم. بەڵام حەزم دەکرد تەنیا کاربکەم . من زانیم دەتوانم وێنەی کەسێك بەدی بێنم کە لە بەرامبەر شتێکدا لە دەرەوەی چوارچێوەی وێنەکە کردەوەی خۆی نیشان دەدا. بە جۆرێك کە بینەر پێی وابێ کەسێکی تر لە گۆڕێ دایە.

لە راستیدا ئەو کاتە زانیم دەتوانم ئەو کۆسپە چارەسەر بکەم کە لەگەڵ (( رۆبێرت لۆنگۆ[3])) بۆ بینینی (( دەوید ساڵ[4])) چوین. ئەو بۆ گۆڤارێکی کەم نرخی پۆلیسی کاری دەکرد. من چاوەڕوانی کۆتایی((ووتە هونەرییەکانی)) رۆبێرت و دەوید بووم و زۆریش ماندووبووم. هەر بەوجۆرەی کە نیشتبووم. چاوم بەوینە گەلێکی١٠ x ٨ درەوشاوە کەوت کە لە گۆڤارێك بوونەوە. ئەوە یەکەم تروسکە بوو کە لە زەینمدا پەیدابووە. جەین سیگیل (س): لە (( وێنە بێ ناوەکانی فیلم)) دا کاریگەری ئەستێرە سینەماییەکان چ بوو؟ وا پێدەچێ کە ئێوە شەیدای ئەستێرە

١- وێنەگری پۆست مۆدێرنی ئەمریکی.

(2) jeanne Sieyel
(3) Robert Longo
(4) David Salle

ئەورووپاییەکان بوون. ئێوە لە وتەکانی خۆتاندا ژان مۆرۆ[5]، بریژیت باردۆ[6] و سۆفیا لۆرێن[7] ناو دەبەن بۆچی ئەوانەتان خۆش دەوێ؟

(ش): چونکە وابیردەکەمەوە کە لەرووی جوانی و روالەتەوە بەپێچەوانەی ئەستێرە کەمناوبانگەکانی ئەمریکی، جوانی و دلڕفێنییەکی ئەوتۆیان نەبوو. کاتێك بیر لە ئەکتەرەکانی ئەو کاتەی ئەمریکی دەکەمەوە، لە زەینمدا بۆمبای جینسی سپی، ناز و خەملیو بەزیڕ و زیوو پالتۆی پێست پەیدا دەبن، بەلام کاتێك بیر لە ژان مۆرۆ و سۆفیا لۆرێن دەکەمەوە، ئەوەی بەزەینم دەگا بریتییە لە کەسانێك کە لە چینە زەرەرمەندەکانی خوارووی کۆمەلگاو زیاتر لە ژنانی چینی کرێکار دەچن.

لەوکاتە دا هەولم دەدا لاسا ئەکتەرەکان بکەمەوەو ببمە رکەبەریان، من نەمدەویست تەنیا کەسێك رەچاو بکەم. من زۆر فیلیمم دیتبوو کە ئەو ژنانە دەوریان تێدا گێڕابوو. بەلام زیاتر لەوەی ئیلهام لەو ژنە ئەکترانە وەربگرم، شەیدای خودی فلیمەکان و ئەو هەستانە دەبووم کە تێیاندا نمایش دەکران.

(س): پێوەندی نێوان ((وێنەبێ ناوەکانی فیلم))ی ئێوە و وێنە واقعییەکانی فلیم چییە؟

(ش): لە وێنە ریکلامییە راستییەکانی فیلمەکان لە دەیەکانی ١٩٤٠ و ١٩٥٠ دا شتێکی زیاتر جینسی و جوان نمایش دەکرا تاوەکو خەلك بۆ بینینی فلیمەکان رابکێشن و یان لە ریکلامی فلیمە ترسێنەرەکاندا ژنێك نیشان دەدرا کە لە ترسان هاواری دەکرد.

(5) Jeanne Moreau
(6) Brigitte Bardot
(7) Sophio Loren



ئەو وێنانەی فیلمی من هۆگریان بوو (کە هەلبەت ئیلهام بەخشی کارەکانم بوون) بە و جۆرە نەبوون. هەر لەبەر ئەم هۆیە کاری خۆم وە نزیکترن.

چونکە هەردووکیان لە حالەتێك دەدوێن لەنێوان توندوتیژی و هەستی جینسی دایە. بەلام من بەوەم زانی کە وەها بەراوەردێکی وێنەیی هەلەیە، چونکە وبەراوردکرد نەدابەرهەمی من دەیدۆڕێنێ. پێم وایە کە قارەمانەکانی من تا ئەورادەیە تێکەلاوی دەوری خۆیان نابن، هەربۆیە ناتوانن بەراستی لە هیچ یەك لە ((فلیمەکانیان)) دا بوونیان هەبێ. قاوەمانانی من بە تەواوی لە گالتەجاڕ دەورێ خۆیان ئاگادار بوون، هەربۆیە زۆر بەیان خۆیان گێلێ دەکرد. وێنەی فیلمەکانی من لەم بوارەدا بوون. ساختەیی دەورەکان، سوکایەتی کردن بە بینەران کە زۆربەیان نێرینەبوون و بەچاوی سیکسی لە وێنەکانیان دەڕوانی.

(س): قەیرانێکی تر ئەو گومانە بووکە بۆ چوونە هەمیشە دووپاتکراوەکان لەسەر بنەمای تێڕوانینی ((نێر)) دیاری دەکرێ، ئایا ئەوەتان تەنیا لەو روانگەوە دەدیت یان ئەو ژنەش کە خۆی لە ناو ئاوێنەدا دە دۆزیەوە[1] لە ئارادابوو؟

(ش): چونکە من ژنم هەر لە خۆوە، وام دانا کە ژنان دەستبەجێ دەوری خۆیان دەدۆزنەوە و هیوادرایش بوون پیاوان لە هەستی قارەمانانەی ژن تێبگەن. و لە دیاری کردنی دەوریان یارمەتییان بدەن. ئەوەی کە پێشبینم نەکربوو ئەوە بوو هێنیدیك لەو کەسانە وایان دەزانی کە من لەگەل روانگەی نێرینە هاوڕام.

لەبەر ئەوە رەخنەی لایەنگرانی یەکسانی ژن و پیاو کە وایان دەزانی من لایەنگر یا هاندەری دەوری ژنم وەك قوربانی یان ئامرازی سیکسی، لای من روون بوو.

(1) ئاماژە بەیەکێك لە وێنەپۆست مۆدێرنەکانی شێرمەنەکە باس لە شەیدابوونی بە خۆیان (ژنان) و چاخی فەرهەنگی و کومەلایەتی ژنان لە دەیەکانی ١٩٥٠ و ١٩٦٠ دەکات.